THE EARTHEN FORTRESS

رۆمان

# قەڵای خۆڵین

سەرهاتی خانەوادەیەکی مۆریسکی
لە ئەندەلووس

نووسینی
ئەحمەد عەبدوللەتیف

لە عەرەبییەوە
سەباح ئیسماعیل

دەزگای فام

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAMpublication

بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری



عنوان الرواية

حصن التراب

تأليف: أحمد عبداللطيف

الناشر: دار العين للنشر. ط١. الاسكندرية ٢٠١٧

ISBN: 9789774904295





چاپی یەکەم - ٢٠٢٤


# قەڵای خۆڵین

سەرهاتی خانەوادەیەکی مۆریسکی

نووسینی

**ئەحمەد عەبدوللەتیف**

لە عەرەبییەوە

**سەباح ئیسماعیل**


بابەت: ڕۆمان

پێوانە

١٣.٥*٢١سم (٢٥٦) لاپەڕە

ISBN: 978-9922-709-04-8

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان، ژمارە سپاردنی (٦٥٦)ی ساڵی ٢٠٢٣ی پێ دراوە.

## سوپاس و پێزانین

* سوپاسی مامۆستا "بەهار موفتی" دەکەم، دوای ئەوەی لە بەدەستهێنانی ڕۆمانەکە تەواو نائومێد بووم، ئەم بە خەمخۆرییەوە لە سۆراخکردنی نەوەستا، تاکوو بۆی پەیدا کردم، منەتبارم.

# پێشەکی

یەکێك لەو ژانرانەی ڕۆمان لەم ڕۆژگارەدا زۆر بایەخی پێ دەدات، ڕۆمانی خەیاڵی مێژووییە، ڕۆمانی عەرەبی لەم دەساڵەی دواییدا دەیان ڕۆمانی خەیاڵی مێژوویی بەرهەم هێناوە. ئەم ڕۆمانەش چەشنی ڕۆمانی "ماڵە ئەندەلوسیەکە"ی واسینی ئەلئەعرەج، "سێینەی غەڕناتە"ی ڕەزوا عاشوور، "مۆریسکییەکە"ی حەسەن ئۆرید، "لەژێر دارهەنارەکەدا"ی تاریق عەلی و "دوا مۆریسکی"ی سوبحی مووسا، هەموویان قسە لەسەر ناسنامە و سەرهاتی ئەو خەڵکە پەراوێزخراو و ئاساییانە دەکەن کتێبەکانی مێژوو پشتگوێی خستوون. هەڵبەت مەبەست لەم بە ڕۆمانکردنی مێژووە ئەوەیە، بۆ قووڵکردنەوەی هەستمان بەرامبەر تراژیدیاکە، دەبێت پەنا بۆ ئەدەب ببەین.

ئەم ڕۆمانە باسی ئەو موسوڵمانانە دەکات کە دوای لەدەستدانی دەسەڵاتی ئیسلامی لە ئەندەلووس، لەژێر دەسەڵاتی کرستیاناندا مانەوە و ناچاری گۆڕینی ئایینیان کردن، پێیان دەگوتن مۆریسکی.

لێرەدا ڕۆماننووس وەك ئەزموونگەرێك لە ڕێگەی خەیاڵی مێژووییەوە باسی خانەوادەیەك دەکات "محەمەد دی مۆلینا"، بە پەنابردن بۆ دەستنووس و نامە و دیکۆمێنت و ڕاپۆرتی نهێنیی

دادگەکانی پشکنینی ئەو کاتە، ڕازی پتر لە دوو سەدە و نیوی ئەو بنەماڵەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە. باپیریان وەسیەت بۆ ڕۆڵەکانی دەکات پشتاوپشت مێژووی ئەو بەهەشتە ونبووەیان بنووسنەوە و وەریبگێڕن و ڕێکی بخەن و لە ژێرزەمین و تونێل و کونوکەلەبەری ماڵەکانیاندا بیانشارنەوە، چونکە یادگە وێرانەیە و نووسینیش نۆژەنکردنەوە. لەو نێوەدا گێڕەرەوەکان مێژووی مۆریسکییانمان بۆ دەگێڕنەوە، هەر لە هاتنە ناوەوەی کاسۆلیکان بۆ شاری کوینکا و سەپاندنی ئایینی کرستیانی و زمان و جلی ئیسپانی بەسەر ڕامکراواندا. وێڕای ئەمانەش ئەوی مایەی سەیرە بە خەیاڵ و خەونی گەڕانەوەیان بۆ زێدی خۆیان، کلیلی ماڵ و نەخشەکانیان هەڵگرتبوون و زمانی ڕەسەنی خۆشیان پاراستبوو و لە ژێرەوە هەر لەسەر ئاینەکەی خۆیان مابوون، کەچی ئینجاش ئەوانی بوون بە کرستیان بۆ ئەوەی خاکی خۆیان جێ نەهێڵن، جێگەی گومان بوون و کەوتنە ژێر لێپرسینەوەی دادگەکانی پشکنین و ناچاری کۆچپێکردن هاتن، یاخود ئەشکەنجەدران و لە ملیان درا.

هەڵبەت ئەم ڕەفتارانە بە شێوەیەك لە شێوەکان جۆرێك لە تۆڵەسەندنەوەیان لە خۆ گرتووە، چونکە ئەو دەمی ئەندەلووس بە دەستی عەرەبەوە بوو، فەرمانڕەوایانی موسوڵمان هەرگیز فریشتە نەبوون. بە درێژایی کات دوای ڕێنماییەکانی پێکەوەژیان نەکەوتوون، مەبەستیشیان پێڕەوکردنی بەهاکانی ئایین و بڵاوکردنەوەی نەبووە. لە کۆتاییدا ئامانجیان دەسەڵات و دەستبەسەرداگرتن، بەدیهێنانی گەورەترین بڕی تاڵانی، فەرمانڕەوایی و دەسەڵات بووە. بۆیە ڕووخان، یان دەسەڵات دۆڕان لەبەر ئەوە نەبوو پاشایانی کاسۆلیك بەهێز بوون، بەڵکوو

لەبەر ئەوەبوو لاوازی دزەی کردبووە هەموو کونجوکەلەبەرێکی دەوڵەتی ئیسلامییەوە. وەك هەموو جارێك ئەوی باجەکەی دایەوە خەڵکە فەلاکەتبار و شەکەت و چەوساوە و نەدارەکە بوون.

**وەرگێر**

**بەر لە خوێندنەوە**

ئەم ڕۆمانە هەندێك ئاماژەی لینكی موزیك و فیلمی دیكۆمێنتاریی تێدایە (كە لەم كتێبەدا دەزگای فام كردوونی بە **كیو ئاڕ كۆد**)، ناكرێت بێ ئەوەی پەنایان بۆ ببرێت ڕۆمانەكە بخوێنرێتەوە و دۆخەكە وێنا بكرێت، ئەمانە بەشێكی دانەبڕاون لە گەمەی گێڕانەوەكە.

**نووسەر**

سێ ئافرەتی ناسکۆڵەی عەرەب
چوون سێو لە "جەییان"
بچنن
بینییان لێ کراونەتەوە:
ئایشێ و فاتیمە و مەریەم
گوتم خاتوونینە،
ئەی ئەوانەی ژیانتان دزیم
ئێوە کێن؟
ئێمە کرستیانین کاتی خۆی موسوڵمان بووین
لە "جەییان":
ئایشێ و فاتیمە و مەریەم

**(لۆرکا، گۆرانییە میللییەکان)**

# 1

باوکم تێبینیی ئەوەی کرد هەندێك لە گەڵای درەختەکان دەوەرن. بینی لە گەڵایەك نزیك دەبێتەوە و دەیخوێنێتەوە. گەڵاکەی هێندەی دەستی دەبوو، تەواو زەرد هەڵگەڕابوو. زۆر پایزیی بوو. بینی ناوی لە نێوان چنراوەکانیدا هەڵکۆڵرابوو. لە خەودا باوکم دەرکی بە ئاماژەکە کرد. سەرلەبەیانییش بە دەنگێك لە شوێنێکی ترەوە دەهات، پێی ڕاگەیاندم گەڵاکەی لە درەختی ژیان هەڵوەری. بە شێوەیەك پێی ڕاگەیاندم چون مەبەستی زەلامێکی تر بێت. پێی ڕاگەیاندم چل ڕۆژی لە ژیاندا ماوە.

باوکم لە مەرگ نەدەترسا. مەرگ بە قسەی باوکم، تەنیا گواستنەوەیە لە ژیانێکەوە بۆ ژیانێك. دەستهەڵگرتنە لە بەسەرچوو بۆ بردنەوەی هەمیشەیی. مەرگ، بەپێی قسەکانی باوکم، دەرکەوتنی شاراوەکان و داماڵینی ڕاستییەکانە. باوکم لە بەرامبەردا سڵی لە ژیان دەکردەوە.

ژیان، بەپێی قسەکانی باوکم، زنجیرەیەکی بێکۆتاییە لە مەتەڵ و داو. ژیان بە قسەی باوکم، تەنیا بارستاییەکی کەڕە، مایەی نیگەرانییە پتر لە دڵنیایی.

باوکم لە ژیاندا وەکوو بنچکە گیایەکی بیابانی هەستی بە

خۆی دەکرد. گیایەك لە ڕەگەوە هەڵیانکێشا، تاکوو لە خاکێکدا بیچێنن خاکی خۆی نەبوو. گیایەك سوور بوون لەسەر ئەوەی بە مەرجەکانی گڵە نوێیەکە بژی، بێ ئەوەی دەرك بەوە بکەن ئاو وێڕای زۆروزەبەندییەکەی دەڕژێتە جێگەیەك شوێنی ئەو نییە. دەڕژێتە ئامانجێکەوە ئامانجی ئەو نییە.

لە دوا گەڕانەکانمان بە شاردا، باوکم چۆن نیگای دەکردم بەو ئاوایە لە درەختەکانی دەڕوانی. بە بێدەنگی ماڵئاوایی لێ دەکردن وەك ئەوەی ماڵئاوایی لە من بکات. بە هەستی خەمبارییەوە خوداحافیزیی لە هەتیویی پێشوەختەیان و بێکەسیی من دەکرد. باوکم هەنگاوەکانی سست و لەسەرخۆ بوون، خۆی دابووە سەر گۆچانەکەیدا، ئای لەو سەمەرەییە، ساڵانی درێژی لەنگیی کورت دەکردنەوە. بە شێوەیەکی ڕۆمانسی وەڵامی پرسیارەکەمی هەمبەر غەریبکەوتنەکەی دەداوە. لە گۆڕستانەکانیش، شوێنی جێگیریی جەستە و خاڵی دەرچوونی ڕۆح، باوکم داوای کاغەزە کۆن و ڕۆژنامەی لێ کردم. وای ڕاسپاردم چون ئاخیرییەکەی لە بارێك ڕزگاری بووبێت سروشت دایبێت بەسەریدا. سروشت یان مرۆڤ، یاخود سروشتی مرۆڤ. لە نێوان خۆشیی قوتاربوون لە پابەندبوون و بەزەییهاتنەوە پێمدا، نیگاکانی باوکم مایەی سەرسوڕمان بوون.

لە چل ڕۆژی دواییدا، هەر بە ڕاستی باوکم ژیانی جێ هێشت. لە نێوان ژیان و ژیانەکەی دیکەدا بوو. باوکم بە جەستە لەگەڵمدا بوو، بەڵام ڕۆحی فڕیبوو. بە چاوانی پڕ لە فرمێسکەوە قسانی لەگەڵدا دەکردم. بە دوو چاوی بەقووڵداچووەوە مێژوویەکی دەگێڕاوە پێشتر نەمدەزانی. یاخود دەمزانی و نەمدەزانی. مێژوویەك چاوەڕوانی بووم وەك ئەوەی ئینتیمای بۆ

من نەبێت، وەك ئەوەی ئینتیمای بۆ من هەبێت. بە شێوەیەك لێی دەڕوانم چون تەماشای مۆرێکی خڕ بکەم بە دەوری ناوکمەوەیە. وەك یەکێك موڵك و ماڵی هەبێت، بەڵام ئازادیی سەوداکردنی نەبێت. چەشنی پاشایەك فەرمانڕەوایی بە دەستەوە نەبێت. مۆرێکی کەسك ناسنامەکەی هەڵگرتووم، وەك ئەوەی تریاکی دژە ژاری ونبوون بێت. چون ونبوون بێت دژی ژاری ناسنامە.

بۆ یەکەمین جار باوکمم پیر هاتە بەر چاو. چووبووە تەمەنەوە. بۆ یەکەمین جار باوکم بە حیکمەتی ئیلاهی، حیکمەتێك ژیانێك کورت دەکاتەوە هێشتا نەژیاوم. حیکمەتێك مێژوویەکی پێ دەگێڕێتەوە مێژووی منە. مێژوویەك چۆن جینەکانی باوکانمان بۆ ماوەتەوە، ئاوا بۆ منیش مایەوە. چۆن خەونێکی ڕاگوزەر ژیانمان دەگۆڕێت؟ لە چ خاڵێك لە پانتاییدا ڕۆح لە غەیب ڕادەمێنێت؟ چۆن لە نێوان شەوێك و سەرلەبەیانییەکدا پیر دەبین؟ ئایا لە کۆتاییدا پیریی باوکم بەرئەنجامی مانەوەیە لە جێگەی گواستنەوەم لە دووڕیانێکدا؟ چما نیگەرانیی گواستنەوە لە خاکێکەوە بۆ خاکێك، لە جیهانێکەوە بۆ جیهانێك، پیریی بەرهەم هێناوە؟ یاخۆ باوکم بە چاوی خۆی جیهانەکەی تری بینی و لەو جیهانەی دیدا شتەیلێك هەبوون سەریان سپی دەکرد و ئاوەزیان دەبرد؟

لە حەفتا و پێنج ساڵیدا، باوکم لە ژیان دەردەچوو تاکوو جەستەی لە خاکدا سەقامگیر ببێت. ون دەبوو بۆ ئەوەی ڕۆحی لەوێ ئارام بێت، لە جیهانێکدا هیچی لە بارەوە نازانم. لە بیست و پێنج ساڵیدا دەچوومە ژیانێکەوە باوکم بەوپەڕی هۆشیارییەوە تەڵەکانی دایە دەستمەوە. تاکوو بەوپەڕی ویستی خۆمەوە بە نێو

ئەم هەموو چاڵانەدا بڕۆم و بە دوو پێی شۆڕەوەبوو بە لێواری هەڵدێرێکەوە دەڕوانێتە سەر عەدەم، دانیشم.

چەندێك هەنگاوێك لە ژیان بچوومایەتە پێشێ، باوکم دوو هەنگاو لێی دوور دەکەوتەوە. چەندێك گەنجتر ببوومایا ئەو پیرتر دەبوو. چون ژیان لەوپەڕی بێگەردییدا شوێنێك بێت جێگەی دوو کەسی تێدا نەبێتەوە. ژیانی من بە مەرگی ئەو نەبێت ناچێتە سەر و پێگەیشتنم تەنیا بە مەرگی ئەو دەبێت.

# 2

## له كاغەزەكانی ئیبراهیمی كوڕی میگێل دی مۆلینا
## تەتوان/ ١٦٧٩

### (1)

له خانوویەكی یەك نهۆمیی قوڕدا دەژیایین، سەرەوە تاقە ژوورێكی لێ بوو. له بەردەم ژوورەكەدا بانێكی فرەوان و شانەیەكی هەنگی لێ بوو. شانەیەك باوكم چەشنی خانووەكە له باپیرمەوە بۆی مابووەوە. شتەیلی تریشی بۆ مابوونەوە له دواییدا بۆ من دەمێننەوە. شانەیەك نەیدەزانی داخۆ دەیپارێزم یان نا. خانوویەكمان له ژیاندا هەبوو لەگەڵ حەوت دارخورما. باپیرانم هیچیانم نەبینی، مەگەر لەو نیگارانەی به دەست نەخشێنرابوون.

نهۆمی ژێرەوە له سێ ژوور و داڵانێك پێك هاتبوو، لەگەڵ ئاودەستێك به حاڵ جێی كەسێكی لێ دەبووەوە دابنیشێت، هەروەها مێزێك باپیرم له هیچەوە خولْقاندی. لەژێر پەیژەكەی دەچووەوە سەربانێ، باوكم تەنوورێكیشی بۆ نانكردن دروست كرد.

ئەو سێ ژوورە یەكیان تەختەخەوێك و كانتۆرێكی جلهەڵگرتنی تێدابوو. ئەوی دی حەسیرێك و دوو تەختەخەوی لەخۆ گرتبوو (یەكیانمان هەر بەكار نەهێنا). هەرچی سێیەم بوو سێ قەنەفە و مێزێكی داری تێدا بوو.

ژووره‌كه‌ی بان، بانیژه‌یه‌كی داری هه‌بوو، پێشتر پێم نه‌نابووه ناوی. ئه‌و ژووره به میچه قرمیدییه‌كه‌یه‌وه، له چل ڕۆژی دوایی ته‌مه‌نی باوكم جێگه‌ی حه‌سانه‌وه‌مان بوو. شوێنی پێكگه‌یشتنی ئه‌وی بوو و ئه‌وی ده‌بێت بوو. ئه‌گه‌ر حه‌زی باوكم به دی بهاتبایا ڕۆژێك له ڕۆژان ده‌بووه ماڵی من و كوڕه‌كه‌م.

ژووره‌كه‌ی بان، سندووقێكی گه‌وره و قه‌ره‌وێڵه‌یه‌كی تێدا بوو، ده‌رگه‌یه‌كی كراوه بوو به‌سه‌ر مێژوودا. ئه‌و مێژووه‌ی هیچم له باره‌یه‌وه نه‌ده‌زانی. ئه‌و ڕابردووه‌ی ده‌بوو تێیدا بژیم. ئه‌و ژووره‌ی به دیمه‌ن هه‌ژار و له ناوه‌وه ده‌وڵه‌مه‌ند بوو. باوكم بردمییه ناوه‌وه‌ی. بردمییه ژووره‌وه، چونكه نۆبه‌ره‌ی بووم. بۆیه بردمییه ژووره‌وه، چونكه تاقانه‌ی بووم، مێژوومانی بۆ جێ هێڵام. مێژووی خانه‌واده‌كه‌م. ئه‌و خانه‌واده‌یه‌ی جگه له ژیانی پاش مردن هیچم ده‌رباره‌ی نه‌ده‌زانی. ئه‌و مه‌رگه‌ی باوكم سڵی لێ ناكاته‌وه. لێی ناترسێت، چونكه هه‌ر پێی ده‌گات. بۆ ژووره‌وه‌ی بردم و له‌وێ جێی هێشتم. له ژووره نهێنییه‌كه جێی هێشتم. له ڕابردوو جێی هێشتم. ئیدی له ژووره‌وه به باوباپیرم ئاشنا بووم.

## 3

باوكم گوتی: هەموو ئەم دەستنووسانە بۆ تۆن. گوتی: بیانپارێزە. گوتی: شتیان بخە سەر. گوتی: بەر لەوەی بتوێنەوە و لەناو بچن لەبەریان بنووسەوە. گوتی: دوای خۆت بۆ كوڕەكەتیان جێ بهێڵە. باوكم قەیرێك بێدەنگ بوو، دوای ئەوە ڕوونی كردەوە: لە دوورەشارێك، كاتی خۆی بێت تێدەگەیت، ئەو كاتەی وا نزیك بووەتەوە، دەبێت كاغەزی تر بدۆزیتەوە. كاغەزەیلێك من نەمتوانی بەدەستیان بهێنم!

باوكم لەسەر زەوییەكە دانیشت و پشتە چەماوەكەی دایە كۆنە دیوارێكەوە. گوتی: باوكم پێش ئەوەی بمرێت، لە دەستنووسی سیحربازان و دەستنووسانی شارە دوورەكەی ئاگەدار كردمەوە. ئەودەمی پێی ڕاگەیاندم خەریك بوو دەگەیشتمە پەنجا سالی. تەمەنی جێهێشتن و كونجكۆلیم تێپەڕاندبوو.

## 4

نەمدەزانی سندووقەکە داخۆ نووسینێکی تێدایە دەربارەی دایکم، یاخود تەنیا تایبەتن بە باپیرانەوە. لێ ئەوی سەرقاڵی کردبووم، هیچ نەبێت لە ساتەکانی یەکەمی هەواڵەکەدا، دەترسام شتێك بزانم بە دڵم نەبێت. ترس لەوەی بە دەستی خۆم سندووقی پاندۆرا[1] هەڵبدەمەوە و جگە لە نیگەرانی و مەترسییەکان هیچم دەست نەکەوێت. ئیدی لە نێوان ترس و لاپرەسەنیدا دۆش دامابووم. کپیی باوکم لە ماوەی هەموو ساڵانی ڕابردوودا هۆکارێکی تر بوو بۆ سەرسوڕمان. ئاخۆ بە ڕاستی دەمەوێت دەستنووسەکان بخوێنمەوە و ئاگەداری دیرۆك و باپیران بم، یاخود من بە خۆڕسك لە کاغەزەکاندا لە دایکم دەگەڕێم دوای ئەوەی لە واقیع بزر بوو؟

ژوورەکەی باوکم، کە بە درێژایی ئەم هەموو ساڵە دوور بوو، ئێستا بووەتە چەقی ناوەند. ئەو ڕابردووەشی بێ گەڕانەوەیەکی ئارەزووکراو دوایی هات، ئیدی دەبێتە ئێستا و ڕەنگە ئایندەش. لە کاتی بەدواداچوونی باوکم و گوێگرتن لە ڕاسپاردەکانی، دەبێت دەست بە لەبەرگرتنەوە و وەرگێڕان بکەم.

---

[1] **سندووقی پاندۆرا:** لە ئەفسانەی گریکیدا هاتووە، ئەو سندووقەیە تژییە لە هەرچی خراپەکاریی مرۆڤ هەیە لە؛ چنۆکی، لووتبەرزی، بوختان، درۆ، ئیرەیی، لاوازی و بێئابڕوویی. "وەرگێڕ"

## 5

"بیابان بەوپەڕی پانوبەرینیی خۆیەوە بۆ ئەو تەنگ بوو، بۆیە خۆی هاویشتە یەکێك لە خەڵوەتگەکانەوە."

**(مەسنەوی، ڕۆمی)**

# 6

- ئێمەی قەشەکانی کوینکا پێمان زانی بەڕێز سانچۆ دی کاردۆنا ئەدمیراڵی بە ئایین کرستیانی و بە ڕەگەز ئیسپانی، بۆ موسوڵمانانی بە ناو کرستیانە تازەکان دادەپۆشێت، بەرگرییان لێ دەکات و دەیانپارێزێت، لە ماڵەکەی خۆیدا میوانداریان دەکات و لەگەڵیاندا گۆشتی مەڕ دەخوات. ئەوانیش لە ماڵەکانی خۆیاندا داوەتی دەکەن و لە ماڵیاندا گۆشتی مەڕ دەخوات، باش دەزانێت ئەوان گۆشتی بەراز ناخۆن و مەی ناخۆنەوە، کەچی پێمان ناڵێت.

- تۆمەتەکە لە کوێدایە؟!

- تۆمەتەکە ئەوەیە نووکە بۆم گێڕایەوە.

- من هیچ تاوانێك لەوەدا نابینمەوە ئەوانی بە کرستیانانی نوێیان گاز دەکەن گۆشتی مەڕ بخۆن، هەروەها هیچ تاوانێکیش لەوەدا نابینمەوە گۆشتی بەراز نەخۆن و مەی نەنۆشن. هیچیش بە پێویستی نازانم زمانیان لێ بدەن.

- تۆ بە سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی کڵێسا تاوانباریت، کە تێیاندا هاتووە دادگایی هەر کەسێك بکرێت دەربکەوێت بووەتە موسوڵمان، هەروەها دادگایی ئەو دراوسێیانە بکرێت دەزانن دراوسێکانیان بوونەتە موسوڵمان و دەنگیان نەکردووە.

- دووبارەی دەکەمەوە: من هیچ تاوانێك لەوەدا نابینمەوە

یەکێك بە دڵی خۆی بخوات و هەندێك شتیش نەخوات. هیچ تاوانێکیش لەوەدا نابینمەوە بچێتە سەر هەر ئایینێك. بە پێویستیشی نازانم زمانیان لێ بدرێت. موسوڵمانان، یاخود کرستیانانی نوێ دراوسێ و کەسوکارمن، هاوەڵی منداڵی و هاورێی گەنجیمن، ئەوانیش وەك ئێمە ئیسپانین، لێرە لەدایك بوونە و کشتوکاڵیان کردووە، لێروکانە لە نیوانماندا گەورە بوون و لەگەڵیاندا بەروبوومەکەیانمان دوورییەوە. باوك و باپیر و باپیری باپیریان لێرە ژیاون و شارەکەمانیان بنیات نا.

- تۆ هەروەها تاوانباری بە چێکردنی مزگەوت بۆ موسوڵمانان، ئەم تاوانەش لە سەرووی تاوانەکانی دیکەتەوەیە.

- ئەگەر رێزگرتن لە بیروباوەڕ و یارمەتیدانی زۆرلێکراوان بە تاوان دابنەیت، ئەوا من تاوانبارم.

- لەبەر ئەوەی خۆت دانت بە تاوانەکەتدا نا، ئەوی بەسەر موسوڵماناندا دەچەسپێت بەسەر تۆشدا دەچەسپێت: ئێمەی قەشانی کوینکا، بە دەسەڵاتپێدانی قەشە تۆماس دی تۆرکیمادا بڕیارمان دا، سەرلەبەیانیی یەکەمی مارسی ساڵی ١٤٧٨، بە تاوانی بنیاتنانی مزگەوت و پەنادانی موسوڵمانان، بەڕێز سانچۆ کاردۆنا دی ئەدمیراڵ لەدار بدەین.

(لە دادگاییکردنەکەی سانچۆ کاردۆنا دی ئەدمیراڵەوە، کوینکا ١٤٧٨)

# 7

به بینینی خەونەکە، وەکوو گوتم، باوکم چووە خانەی مردووانەوە (یاخود زیندووان؟!). بەیانیان و ئێواران، دەمبینی ڕۆحی بەناو ماڵەکەدا دەسووڕێتەوە. هەرچی جەستەی بوو تەنیا کۆنە کۆگەی ژیانێکی بەسەرچوو بوو. جەستەیەك بە هێزێکی نەبینراو و بە ڕوویەکی زەردەوە دەجوولێتەوە. بەڵام توانای هەڵچوونی هەبوو. بە زمانێك چون بیانکێشێت پەیڤی لێ دەتکا. بە دوو گوێوە هیچیان نەدەبیست مەگەر لە شوێنێکی نادیارەوە بهاتایا.

وشە ئیلهامبەخشەکانی باوکم دەتگوت کچی سرووشی خودایین، لە هەموو ساتە درێژەکانی بێدەنگیدا دەردەپەڕین. وشەی کورت، چون پوختەی زمان بن. باوکم بێ ئەوەی دەرك بکات بۆی سەلماندم، مەرگ بێگەردیی دەبەخشێت، چەندێك ڕۆح لە سەقامگیریی خۆی نزیك ببێتەوە، چاك دەبێتەوە. باوکم لەوێ بوو، پێیەکی لە جیهانەکەی دی و پێیەك لە جیهانەکەی خۆمان. لە ڕۆژەکانی دوایی باوکمدا، من تەنیا یادەوەری بووم، هەڵگری ڕاسپاردەیەك. منی تەنیا لەودیو شووشەوە دەبینی، شووشەیەك مردووی لە زیندوو جیا دەکردەوە.

گوتی: ڕازەکە بپارێزە. نەمدەزانی ڕازەکە چی بوو. باشە بۆ دەبێت بیپارێزم. کەچی دڵکاری (جدية)ی باوکم یەکلاکەرەوە

بوو. لەوەوە زانیم چوومەتە جیهانێکی نەزانراوەوە. ئیدی کۆتاییی گەمەکەم کەوتە بەر چاو. گەمە نییە. گاڵتە نییە. وای بۆ دەچووم دلکارانەتر دەبێت، ئەمەش لە ساتێك لە ساتەکاندا، کاتێك لە چاوە مردووە خۆڵەمێشییە بەقووڵداچووەکانی باوکمم ڕوانی، هەستی ونبوون دایگرتم. لە چ ونستانێکدا (هەزار داڵانێکدا) دەخولێمەوە، لە چی مەلەکووتێکی تاریکدام.

باوکم لە داخستنی دەرگەکە دڵنیا بوو، وێڕای ئەوەی ئێمە بە تەنیا دەژین. دانیشتین. لەسەر حەسیرێك دانیشتین پێشتر لەسەری دانەنیشتبووم. لەو ژوورەی هەرگیز نەمبینیبوو ڕامام. تێبینیی درزگەلێکم لە دیوارەکەدا کرد. درزەیلێك خەریك بوو نزیکیی ڕووخانیان ڕادەگەیاند. یاخود بێ ئەوەی من بزانم کەوتبوو. لەودەمەدا ئاوڕم لە دەوروبەری خۆم دایەوە، تاکوو ناواخنی ژوورەکە لە یادگەمدا بپارێزم. ئەو ژوورەی وێڕای قەرەوێڵە و سندووق و حەسیرەکە، قاپوقاچاخ و کووپی مسینیشی لێ بوون. شتگەلێك دیار بوو هی ڕۆژگارێکی ترن. ڕۆژگارێك لەگەڵ درزەکانی دیوارەکەدا هاونەوایە. ڕۆژگارێك لەگەڵ چاوە مردووەکانی باوکمدا ڕووبەڕوو دەبنەوە. ڕۆژگارێکی دوور. ڕۆژگارێك بێگومان نەمبینیبوو. بێگومان، وەکوو بۆی چووم، دەبێت هەموو شتێك دەربارەی بزانم.

# 8

## له کاغەزەکانی ئیبراهیمی کوڕی میگێل دی مۆلینا

**تەتوان/ ١٦٧٩**

(2)

باوکم به دەنگێکی زوڵاڵەوه گوتی: ئەوی بینیم بۆتی دەگێڕمەوه. ئەوی باپیرت بینی بۆتی دەگێڕمەوه، تۆ له ڕۆژگارێکی دوورمەودادا دەیبینیت. خەونێکت بۆ دەگێڕمەوه وەکوو پەیامێکی پیرۆزی لێ هات بۆ نەوەکانمانی دەهێڵینەوه.

درەختێك هەبوو هێندەی شارەکەمان. له پایزدا بووین. خەڵکەکه ڕاپاندەکرد. خەڵکەکه ڕێیان دەکرد. خەڵکەکه دەنووستن. منیش سەرگەردان بووم. کەچی گەڵاکانی درەختەکه دەوەرین. گەڵای گەورە گەورە دەڕژان. گەڵایەلێك له قەبارەی گەڵای درەختی ئاسایی نەدەچوون. هێندەی ناولەپی دەستم بوون. بڕوانه، وەکوو ئەم ناولەپه. بێ ئەوەی ئاگام له خۆ بێت نووشتامەوه و گەڵایەکم لەسەر زەوییەکه هەڵگرت. به ئاگەدارییەوه ناوی خۆم بینی هەڵکۆڵرابوو. ناوی خۆم و دایکم و داپیرم. بەپێی گەڵاکه دەگەڕامەوه سەر دایکم نەك باوکم. گەڵاکەم هەڵگرت، نەمزانی بەرەو کوێ مل دەنێم. لێ دەمزانی گەڵای ژیانه و له درەختی ژیان وەری.

# 9

ئەگەر گوناهی من ئەوە بێت ئەوینی تۆ سەروەرمە، ئەوا هەموو شەوانی ئاشقان پڕ لە گوناهن.

# 10

نیوەڕۆی ڕۆژی خەونەکە، باوکم ڕابوو سندووقەکەی کردەوە. فەرمانی پێ دام هەستم، منیش ڕابووم. فەرمانی پێ دام تەماشا بکەم، منیش تەماشام کرد. سندووقەکە پڕ لە کاغەزی گەورە بوو. کاغەزەیلێك بە وردی وەکوو نووسینە پیرۆزەکان لەسەر یەك دانرابوون. لە نێوان هەر دەستەکاغەزێك و دەستەیەکی تردا کاغەزێك بۆ جیاکردنەوەیان دانرابوو. دەمودەست دەرکم کرد ئەو جیاکەرەوەیە نیشانەی حەکایەتێکی نوێ، یاخود هی سەردەمێکی تازەیە. یان هی پاڵەوانێکی نوێیە. یەکێك لە کاغەزەکان لە پشتییەوە کۆمەڵە کاغەزێکی تر هەبوو، ناوی چوارییی باوکمی لەسەر بوو. کاغەزێك لە پشتییەوە کۆمەڵە کاغەزێکی دی، ناوی چوارەمی باپیرمی لەسەر بوو. پێی گوتم بیخوێنەوە، منیش خوێندمەوە. ناوە چوارینەکانم خوێندەوە. چەندێك دەمخوێندەوە باوکم کۆمەڵە کاغەزەکەی ڕادەکێشا. کۆمەڵێکی ڕاکێشا تاکوو کۆمەڵەکانی تر دەرکەون. دەتگوت کاغەزەکان درەختێکن ڕەگیان لە حەوتەم چینی زەویدایە. دەستەیەکی ڕاکێشا و بە ڕێکی لەسەر عەردەکەی دانا. سەدان کاغەز بوون. سەدان بە قەبارەی جیاجیا. گوتی: لە کۆنەوە بۆ تازە دەست بە خوێندنەوەیان دەکەیت. گوتی: تۆ کارێك دەکەیت من نەمتوانی تەواوی بکەم.

گوتی: تاکوو توانیم لە بەریانم گرتەوە، دەبێت ئەو ڕێگەیەی من پێیدا ڕۆیشتووم تەواوی بکەیت.

وەختێك دەستم بە خوێندنەوەی دەستنووسەکان کرد، تێبینیی ئەوەم کرد کاغەزەکان گەلێك زەرد بوونە. هەندێکیان نیمچە تواوە بوون. هەندێکیشیان خەریکە دەتوێنەوە. سەرنجم دا، بێ ئەوەی مەزەندەی ئەوە بکەم، دەستنووسیان تێدایە بە ئیسپانیی کۆن نووسراون، هەندێکیشیان بە ئیسپانیی کۆن، بەڵام بە پیتی عەرەبی (ئەو زمانە ناعەرەبییەی باپیرانی مۆریسکیم پێیان نووسی و ئیسپانەکان ناویان نا ئەلخامیادۆ، باوکم ئەمەی پێ گوتم). لە خوێندنەوە بە پەلەکەمدا زەحمەتیی زۆرم هاتنە پێشێ، هەڵبەت سالانی فێربوونم بۆ ئیسپانیی کۆن یارمەتیی کردنەوەی هەموو کۆدەکانیان نەدام. هەوڵم دا تێی بگەم و سەر لە خۆم نەشێوێنم. وێڕای خەمخۆریم بۆ جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکە، بەڵام بەڵێنی وەرگێڕانێکی ئەمینتان نادەمێ.

# 11

کەواتە دەبوو دانەدانە بە عەرەبی دووبارەیان بکەمەوە و ئەسڵییەکان بپارێزم. دەبوو لە ئیسپانییەوە وەربگێڕم. پێویست بوو بچم بۆ کوینکا.

باوکم گوتی: دوای لەبەرگرتنەوە، کاغەزەکان ڕێك بخە. لە کاتی لەبەرگرتنەوەدا مێژوو لە کاغەزە مێژوولێدەرەکان بدە. خۆت لە ساڵی کۆچی بپارێزە ئەگەر دەرکەوت، با تەنیا ساڵی زایینی بەس بێت. سەرنج بدە، زمانی باوباپیرانی مودخار[1] و مۆریسکیمان جیاوازە لە زمانی کولتووری عەرەبی، وەکوو چۆن جیاوازە لە زمانی باوباپیرانی ئەندەلوسیمان. تاکوو دەتوانیت هەر باپیرێك و دەنگی خۆی بدەرێ. ئەگەر ویستت ناوی فەرمانڕەوایان پشتگوێ بخە، وەکوو چۆن ئەوان لە دیوەخانەکانیاندا چاوپۆشییان لە ناوی ئێمە کردووە. پاشان ئەوەی دووپات کردەوە: دەبێت لەبەرگرتنەوەکە بە عەرەبی بێت.

ئەو ڕۆژە باوکم بەڵێنی پێ دام سندووقێکی تازەم بۆ بکڕێت. گوتی: سندووقە نوێیەکە بۆ کاغەزە لەبەرگیراوەکانە، بۆ کاغەزە وەرگێڕاوەکانە. سندووقە تازەکە دەبێتە ئەو ئەرشیفەی بە

---

[1] **مودخار:** ڕامکراو و دەستەمۆکان. ئیسپانەکان ئەم ناوەیان لێ نان. واتە: ئەوانی لایەنگری ئیسپانەکانن. موددەجنوون (مدجنون): ئەم وشەیە بەپێی کات گۆڕا بۆ مودیخاریس. ئەو مۆرۆ موسوڵمانانە بوون لە سەرەتای کەوتنی ئەندەلوسدا لە نیمچەدوورگەی ئیبیریدا مانەوە. (وەرگێڕ)

دەستی خۆت دروستت کرد. گوتی: بیر لەوە دەکەمەوە تا چ ڕادەیەك ئاوڕدانەوە لە دواوە سوودی هەیە، چما بە شوێنپێهەڵگرتن پێیە براوەکان دەگەڕێنرێنەوە؟!

لە کاتی لەبەرگرتنەوەی کاغەزەکانی یەکەم، باوکم لەودیو سنووقەکەوە نووشتایەوە و کاغەزێکی لوولدراوی ڕاکێشا. کاغەزێك لە گەڵای زەل دەچوو. کردیەوە زۆر درێژ بوو. لە نێویدا درەختێکی بڵندی لقوپۆپدارم بینی.

گوتی: تەماشا بکە، منیش تەماشام کرد. سەرجەلەی خانەوادە بوو. ڕەنگە تەواو کامڵ بووبێت. سەرەتا لە باوباپیرانی یەکەممانەوە لە کوینکا، بە ناوی من کۆتایی دەهات. بە دەنگێکی یەزدانییەوە فەرمانی بەسەردا کردم، ناوی کوڕەکانیشم بخەمە سەر ناوەکان. گوتی: گشت ئەو کاغەزانە دەدەیتە دەست کوڕە گەورەکەتەوە. وەسیەتی باپیرەمانە کاغەزەکان بدەیتە دەست کوڕە گەورەکەتەوە. گوتی: بەو مەرجەی کوڕە گەورەکەت بێت. گوتی: لە نێوان کاغەزەکاندا کاغەزەیلێك دەبینیتەوە داپیرانت نووسیویانە. ڕۆڵەی داپیرانت دەبینی خۆیان داوەتە پاڵ دایکیان، تاکوو بنەچەیان کوێر نەبێتەوە. بۆ ئەوەی مێژوو دانەبڕێت.

لە بنی سندووقەکە، لە گۆشەیەکی کراوەوە، هەندێك کلیلی لە مس دروستکراوی لێ بوون، باوکم ڕایکێشان و دانی بە من. گەورە و قەبە بوون. چەند کلیلێك بوون هەڵگرێکی زیو کۆی دەکردنەوە. باوکم گوتی، کلیلی ماڵە کۆنەکەمانن. کام ماڵ؟! بە پرسیارەکەم بزەی هاتێ. گوتی: ماڵەکەی کۆنکە.[1] ماڵەکانی

---

[1] کۆنکە: کوینکا Cuenca.

کۆنکه. شاره دووره‌که.

گوتی: ئه‌و شاره‌ی لێوه‌ی هاتین. ئه‌و شاره‌ی لێی شاربه‌ده‌ریان کردین. ئه‌و شاره‌ی ڕۆحمان تێیدا مایه‌وه، ئه‌گه‌رچی نه‌مانبینی.

گوتی: هه‌رگیز ناوه عه‌ره‌بییه‌که‌ی له بیر نه‌که‌ی: کۆنکه، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر ناوی کوینکاشیان لێ نا.

# 12

## له كاغەزەكانی ئیبراهیمی كوڕی میگێل دی مۆلینا

**تەتوان/ ١٦٧٩**

### (3)

باوكم له دەستنووسه ڕیزكراوەكانی سەر زەوییەكە نزیك بووەوە. یەكیانی ڕاكێشا. گوتی: بڕوانە. ڕوانیم. نەخشەیەكی وردی شارێك بوو. شارێكی بچووك. شەقامەكانی زۆر و تەنگەبەر بوون. خانووی تێدا بوون له بەرد هەڵكۆڵرابوون.ماڵیشی تێدا بوون به گرد دەوره درابوون. یەكێك له شەقامەكان به بازنه دەوره درابوو. یەكێك له ماڵەكان به بازنه دەوره درابوو. گوتی: ئەمه شەقامەكەی ئێمەیە. گوتی: ئێره ماڵی ئێمەیە. لەژێر نەخشەی شارەكە، نەخشەیەكی تر هەبوو. نەخشەیەكی وردی ماڵەكه له ناوەوە. ماڵەكه گەوره هاته بەرچاوم، وا هاته بەرچاو لەژێر ماڵەكەدا ژیانێكی دی هەیە. ژێرخانی ماڵەكه چەندین ڕێڕەوی لێ بوو. ژێرخانەكه گەنجینه بوو. لەملا و لەولای نەخشه گەورەكه به خەتێكی جوان به عەرەبی نووسرابوو: كوینكا.

لەنێو كاغەزه واژۆكراوەكانی باوكمدا به ناو و مێژووەوە نیگاری كەسانێكم دۆزییەوە، لەسەر پشت له بان تەختەكان به

دەست و قاچی بەستراوەوە بە گوریس ڕاکشابوون، هەروەها چەندین نیگاری پێچکەیەك پیاوان پێیەوە شەتەك درابوون و هەڵواسرابوون، ئەوجا ئامێرێك لە هەرمێ دەچوو، ئامێرێکی تریش لە شێوەی سێگۆشە. لەژێر هەر نیگارێکدا بە کورتی نووسرابوو: "ئامێری ئەشکەنجەدانی موسوڵمانان". لە نیگارەکانەوە تێگەیشتم ئەو ئامێرە ئاسنەی لە شێوەی هەرمێیە دەبڕزایە دەمیان، یاخود دوایان، هەتا گیانیان لەدەست دەدا. لەسەر تەختەکان لاق و دەستیان ڕادەکێشران، تاکوو لە جەستەیان دەبوونەوە.

بە تایبەت لەو ڕۆژەدا، باوکم بڕیاری دا لەسەر چوارپایە مسییەکە ڕابکشێت. ڕەنگە ئەوە یەکەمین جاری بووبێت جەستەی بەر ئەم کۆنە ئامێرە کەوتبێت. تەماشایەکی کردم، وەك یەکێك یەکەم جاری بێت بمبینێت، لە کاتێکدا من بە سلکردنەوە پەڕەی دەستنووسەکانم هەڵدەدانەوە و بە ترسەوە لە ئامێری ئەشکەنجەدانەکان ڕامابووم.

گوتی: حەتمەن وەڵامی پرسیارەکەت دەدۆزیتەوە.

گوتم: کام پرسیار؟

گوتی: چۆن بۆ ئێرە هاتین و چۆن دەستمان لە خاك و ماڵوحاڵمان هەڵگرت.

# 13

## بەڵێننامەیەکی پەسەندکراوی بەڕێز عەبدوڵلای کوڕی محەمەد دی مۆلینا، موسوڵمان.

**٢٤ی ینایەری ١٤١٤:**

"بەڕێزان ڕەبەنانی کلێسا، لە بارەگاکەیان کۆ بوونەتەوە و بە بەڵگەی بڕواپێکراو، گەواهی دەدەن بەڕێز عەبدوڵلا، ئاسنگەرێکی موسوڵمانە، کوڕی بەڕێز محەمەدی دراوسێمانە لە کوینکا، نیوەی باخەکەی دەکەوێتە گوندی نوئالس، ئەوی موڵکی بەڕێز بیرو سانشێت دلپیار، خوا بیپارێزێت (.....) بوو، کڕی. بە دەوری باخەکەدا لە لایەکەوە: پارچە زەوییەکی پڕ لە درەخت موڵکی.....، لە لایەکی تریشەوە: باخێکی موڵکی میراتگرانی خوان مارتینیس دی پۆلۆ خیلە، لە لایەنی سێیەمیشەوە: ڕێ. لە لایەنی چوارەمیشەوە: ڕێگە".

## 14

منیش عەودالی دوای وەڵامی پرسیارێك بووم.

دایکم سەرلەبەیانیانێکی زستانی هەورین بۆ یەکجاری دیار نەما. ڕەنگە ئەو کات چوار ساڵان بووبم، یاخود کەمێك منداڵتر. ئاخۆ لەمماڵەدا دەژیاین یان لە ماڵێکی تر؟ یادگەم تەواو نییە، لێ بە دڵنیاییەوە، ئەگەر شتێك هەبێت ناوی دڵنیایی بێت، من ئەو سەرلەبەیانییە گازم کرد وەڵامی نەدامەوە. لە گشت ئەو شوێنانە لێی گەڕام بۆیان دەچوو، نەمبینییەوە.

پرسیارکردنی دووبارەم لە بارەیەوە، ئەو پرسیارەی وەکوو منداڵێك بووە تەوەری ژیانم، بێ وەڵام مایەوە. باوکم ئەوەی هەڵبژارد هیوا ببەخشێت نەك دڵنیایی، بۆیە وەڵامەکەی لە "هەر دەگەڕێتەوە"دا کورت بووەوە.

دیارە هیوا، یاخود بەخشینی، بە دڵی بوو، هەر لەبەر ئەمە وەڵامەکەی پتر لە بیست ساڵ نەگۆڕا. منیش لە نێوان خەمی بێ دایکی و تووڕەییدا، مەزەندەی ئەوەم کرد دایکم مردبێت، ئیدی بە تێپەڕینی کات زانیم ڕۆیشتووان ناگەڕێنەوە.

لەو نێوەدا، کاتێك دەکۆشام لە مردن تێبگەم، یاخود باوەڕی پێ بهێنم، باوکم بە شێوەی جیا جیا ئارامی دەکردمەوە. جارێك ڕۆڵی دایکی دەگێڕا، کاتێکی زۆری بۆ تەرخان دەکردم بۆ چیرۆکەیلێك ئەودەم لای من سەیر و باوەڕهێنان پێیان زەحمەت بوو، چیرۆکەیلی ناڕوون و پوخت، جارێکیش بە هەستی

گاڵتەبازییەوە سیمای لە دایکمچووی منی هەڵدەگرت. "بەچکە سەگ تۆنی دەنگی ئەوت بۆ ماوەتەوە"، چەندێك بە ئیسپانی قسانمان بکردبایا وای دەگوت و ئەوەشی دەگوت: "هەروەها دوودڵی و نیگەرانیی ئەوت بۆ ماونەتەوە". هەندێك جار توێکاریی سیمای دەکردم: چاوە فستقییەکانت کوتومت لە چاوانی دایکت دەچن، لووتە بچووکەکەت، برۆ درێژەکانت.. پاشان جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە دایکم نەمردووە، "کوڕەکەم لە کاتی خۆیدا دەیبینیت." هەڵبەت من لە مەبەستی تێنەدەگەیشتم، دەمزانی بەڵێنێکە بە دی نایەت.

ئەوی لە ئەدگاری دایکم و وەسفی باوکم لە یادگەمدا مابێت، چەندین ڕۆژم بە کێشانی نیگارەکانی دایکمەوە بەسەر بردن و بە دیوارەوە هەڵمواسین. یەکێك لەو نیگارانە بۆ هەمیشە لەژێر سەرینەکەمدا مایەوە، تاکوو دواخەونی باوکم هات، ئەودەم نیگارەکەم دەرکرد بۆ کوێ بڕۆیشتمایا لەگەڵمدا بوو. چون مەرگی باوکم ژیانەوەی دایکم بێت.

لەسەر قەرەوێلە مسییەکە، بە دەنگێکی قووڵ خەمی سالآنی ڕابردووی هەڵگرتبوو، باوکم گوتی: لەوانەیە لە کوینکادا بیبینیتەوە. ڕەنگە لە "قەڵای خۆڵین"دا بیدۆزیتەوە. لەودەمی ئەو قسانی دەکرد، دەنگی دایکم لە گوێمدا دەزرینگایەوە. بە زمانە بیانییەکەی دەزرنگایەوە (ئەو زمانەی زمانی منیشە، زمانم هاوشانی زمانە عەرەبییەکەم بێ ناکۆکی ڕێ دەکات). لەگەڵ زەردەخەنە ڕوونەکەی دەزرنگێتەوە.

دایکم بە قژە ڕەشە قەترانییەکەیەوە سپیکەڵانە بوو، دوو چاوی هەمیشە خومار و زارێك دەتگوت ئەنگوستیلەی سلێمانە. دایکم وەکوو هەر دایکێك بۆ منداڵەکانی، باڵادرێژ و پڕ بوو.

## 15

سێ کیژۆڵەی موسوڵمان
له "جەییان" دڵبەندیان بووم:
ئایشێ و فاتیمە و مەریەم.
سێ کیژە موسوڵمانی بەدەو
چوون زەیتوون بڕنەوە،
بینییان ڕنرابوون
له "جەییان":
ئایشێ و فاتیمە و مەریەم.
بینییان ڕنرابوون
بە نائومێدی و
ڕەنگی زەردهەڵگەڕاوەوە
گەڕانەوە
له "جەییان":
ئایشێ و فاتیمە و مەریەم.
سێ ناسکۆڵەی موسوڵمان
چوون سێو لە "جەییان"
بچنن

بینییان لێ کراونەتەوە
ئایشێ و فاتیمە و مەریەم.
پێم گوتن: "خاتوونان،
ئەی ئەوانەی ژیانتان دزیم
ئێوە کێن؟
ئێمە کرستیانین کاتی خۆی موسوڵمان بووین
لە "جەییان":
ئایشێ و فاتیمە و مەریەم.

**"گۆرانییەکی میللی"**

# 16

## له کاغەزەکانی ئیبراهیمی کوڕی میگێل دی مۆلینا
## تەتوان/ ١٦٩٥

### (4)

خەونێکم بینی بەسەر زەوییەکی قوڕاویدا ڕێم دەکرد. چەندێك دەمویست قوتار بم، پێیەکانم پتر بە عەردە ڕەشەکەدا ڕۆ دەچوون. بەردەوام ڕۆ دەچوون، تاکوو قوڕ گەیشتە ناقرگەم، بۆم دەرکەوت جەستەی لاوازم کەوتە پانتاییەکی بێ زەوییەوە. بە ویستێکی سەرشۆڕانەوە ملکەچی ڕاکێشانی تەواوی بووم. خۆم بینییەوە بە تەواوی بەژنمەوە و بێ پەلەی قوڕین لە زەوییەکی تردام. زەوییەك وا دیار بوو چەسپاوترە، بەلام فشۆل. زەوییەك چەندێك بەسەریدا ڕۆیشتبام، ڕووگەم لێ ون دەبوو. هەر هەنگاوێك بچوومایەتە پێشێ، هەستم بە خۆم دەکرد مێینەیەکم لە جەستەی پیاودا. کێ منی پەستایە ناو ئەم جەستەیەوە؟! چۆن هەڵەی وای کرد؟!

لە خەو یان بێداریدا؟! دڵنیا نیم، کەسێکم دەبینی جیا لەوەی دەیبینن. دەنگی حەزەکانم لەگەڵ ئەو دەنگەی لە دەرەوە دەهات، نەدەهاتەوە. ئەوی دەیخوازم لەگەڵ ئەو شتانەی

چاوەڕوانییان لێم دەکرد بەیەکدا دەدەن. من لەسەر ئەم جەستەیە میوانم، یاخود لەپڕ ئەم جەستەیە بووە خاوەنم؟ ئاخۆ من داگیرکەرم، یان داگیرکراو؟!

سپاردەی باوکم، تۆمارکردن و لەبەرگرتنەوەی ئەوی بتوانم هەڵیبگرم لەو کاغەزانە بوو، لەگەڵ حەزی ئەو لە مانەوە لە غەریبیدا نەدەهاتەوە. ڕۆژێك هەستم بە پێویستیی گەڕانەوەی بۆ کۆنکە نەکرد، بۆ جارێکیش ئاماژەی ئەوەی نەدا دەبێت من بگەڕێمەوە. وەك ئەوە وابوو بیەوێت ڕێگەیەك بکاتەوە، تاکوو ئەوانی دی پێیدا بڕۆن. چەشنی نهێنیپارێزی وریا ئەمانەتەکە بۆ خاوەنی بگەڕێنێتەوە. منیش باوکمئاسا، تەنیا ئەڵقەی زریزەیەك بووم. لێ جیاوازیی نێوانمان ئەوەبوو من لە جەستەیەکدا بووم جەستەی خۆم نەبوو، جا نازانم جەستە خوازراوەکەم توانای زاوزێی هەیە، یاخۆ نا!

# 17

شەوێکیان ئیبن عەتائوڵڵا سکەندەری[1] هات بۆ لام. دەڵێم لە بێداریمدا هات، هەرچەندە پێم وایە هاتە خەونم. هات داوای لێ کردم سەردانی گۆڕەکەی بکەم. نەمدەزانی گۆڕەکەی لە کوێیە. شەرمم هاتێ لێی بپرسم، ئاخر وام نیشان دەدا لە موریدەکانی نیم. لە کاتێکدا لە بێداری، یاخود لە خەودا تێ دەفکریم، ئاخۆ دەبێت گلکۆی مورشیدی سالکین لە کوێ بێت، کابرا بزەیەکی بۆ کردم و گوتی: "ئەوی عەودالّم بێت، دەمدۆزێتەوە".

لە هەمان شەودا، ئیبن عەتائوڵڵا چوو بۆ لای ئافرەتێك لە "قەڵای خۆلین"دا نیشتەجێ بوو. ئافرەتەکە دەڵێت، لە بێداریدا هاتووە بۆ لای، هەرچەندە ئەوە بە ڕاست دەزانێت لە خەودا هاتبێت. هاتووە بۆ لای و فەرمانی بەسەردا کردووە سەردانی گلکۆکەی بکات. لێ ئافرەتەکە بوێرتر بوو پرسیاری شوێنی گۆڕەکەی لێ کردووە. کابرا بزەیەکی کرد و گوتی: "ئەوی عەودالّم بێت، دەمدۆزێتەوە".

کازیوەی بەیانیی ڕۆژی دوایی، دەرچووم بەدەم بانگەوازەکەی ئیبن عەتائوڵڵاوە بچم. وەکوو سەرگەردانێك بە شەقامەکاندا ڕێم دەکرد، سەرکۆنەی خۆم کرد، چۆن سەردانی

---

[1] ئیبن عەتائوڵڵا سکەندەری (1260-1309): یەکێك لە پایەکانی ڕێبازی سۆفیگەریی شازلی بوو. نازناوی "مرشد السالکین" و "قطب العارفین" و "ترجمان الواصلین"یان لێ ناوە. (وەرگێڕ)

هەموو ئەولیا و پیاوچاکانم کردووە و سۆراغی ئیبن عەتام نەکردووە.

سەرلەبەیانیی زووی ڕۆژی دوایی، ئافرەتێك جانتاکەی پێچایەوە. هەرچی پێویست بوو پێچایەوە و کەوتە ڕێ. جل و کتێب و کاغەزەکانی لە جانتاکەدا خڕ کردنەوە و ڕۆیشت. لە ڕێگە سەرکۆنەی خۆی کرد، چۆن سەردانی گشت ئەولیا و پیاوچاکانی کردووە و پرسیاری ئیبن عەتای نەکردووە.

لەوێ، لەسەر گلکۆی "قوتبی عارفین"، ئەو ئافرەتەم ناسی، کە دواتر بووە هاوسەری من. ئەودەم من تەمەنم پەنجا ساڵ دەبوو. باوکم چەند مانگێکی کەم بوو مردبوو.

ئەو کات، ئافرەتەکە سی ساڵان بوو، بێ دایك و باب بوو.

لێم پرسی: ئایا مورشیدی سالکین هاتە لات؟

- هات و فەرمانی پێ کردم سەردانی بکەم.

- شێوەی چۆن بوو؟

- سوورباو بوو، تا بڵێی جوان. چما هاتە لای تۆش؟!

- بەڵێ، هات و فەرمانی پێ کردم سەردانی بکەم. هات بۆ لام تێگەیشتم دەبێت شتێك ڕوو بدات.

- بەڵێ، منیش فەرمانی سەردانکردنی پێ کردم، هات و تێگەیشتم دەبێت لێرە بمێنمەوە. هەرچیم هەبوو هەڵمگرتن و هاتم.

- لە کوێوە هاتووی؟

- لە ئاوایییەکەوە پێی دەڵێن "قەڵای خۆڵین". ئەی تۆ؟

- من لێرە لەدایکبوومە، بەڵام خۆمان خەڵکی کۆنکەین.

بە ئیسپانیی کۆن قسانم لەگەڵدا دەکرد. ئەو بە ئیسپانیی نوێ لەگەڵمدا دەئاخاوت. لە یەکدی تێدەگەیشتین.

# 18

## بەڵێننامەی فرۆشتن بە عەبدوڵلای کوڕی محەمەد دی مۆلینا

## ١٢ی ئەپریلی ١٤١٤، کوینکا:

"خاتوو کەتالینا مارتینیسی کیژی گۆنتالۆ مارتینیس دل پییار، ژنی شەرعیی خوان مارتینیس، باخەکەی لە باوکییەوە بۆی مابووەوە، بە تەنیشت کلێساکەی کەوتووەتە نۆئالیسەوە، بە بەڕێز عەبدوڵلا دی مۆلینای ئاسنگەری موسوڵمانی فرۆشت، کە لەم شارە دادەنیشێت. بڕی ٩٠٠ دۆقی زێڕی قشتاڵەی وەرگرت. ئەم زەوییە لە لایەکەوە دەوردراوە بە: زەوییەك مولکی بەڕێز عەبدوڵلا خۆیەتی، لە لایەکەی ترەوە: زەوییەك مولکی بەڕێز خوان سانشێت تیرۆکییە، ئەملا و ئەولای تریشی دوو ڕێگەن (...).

# 19

باوکم وەکوو لە ڕۆژانی داهاتوودا لەسەری ڕادیم، سەرلەبەیانیانی زوو بەناو شاردا دەسووڕایەوە. وەکوو دوا ماڵئاوایی، خواحافیزیی لە گۆڕی پیاوچاکان دەکرد و بە نێوان گۆڕەکاندا هەنگاوی لەگەڵ ڕابردوودا دەنا و ڕێی دەکرد.

من لە گەڕانەکانی باوکم دەگەیشتم، چەندێك ڕێی بداماىا لەگەڵیدا دەڕۆیشتم. من دەمزانی، ئەویش دەیزانی من دەزانم، ئەو بە ئەزموونێکی ڕۆحیدا تێدەپەڕێت هێشتا بۆ لای من دزەی نەکردووە. یاخود بە هێوریی ڕۆژ دزەی دەکردە تاریکییەوە. بە گەڕانەکانی، لە ڕێگەی یادگەوە دەگەڕایەوە بۆ ڕابردوو، یادگەیەك هەر کات خەڵوەتی پتر و قووڵ ببوایەتەوە، چالاك دەبوو. لە خەڵوەتەکەی مندا، لە ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵوەتی ئەودا، منیش لە ڕێگەی ئەو دەستنووسانەی یادگەی سپیمیان ڕەش دەکردەوە، دەگەڕامەوە بۆ ڕابردوو. لەو نێوەدا، پرسیاری من لە لایەکەوە دەربارەی مەرگ لە لایەکی تریشەوە لەگەڵ پرسیارم سەبارەت ئایندە یەکتریان دەبڕی. ئەگەر شتێك هەبێت ناوی ئاخیرەت بێت، ئەگەر بەهەشت لەو دنیا هەبێت، وەکوو باوکم بڕوای وابوو، دەبێت مردووان دروستی بکەن. دیقەتی جوولانەوەکانی ئەمدواییەی باوکم دەدەم، وای بۆ دەچم ماڵئاواییە لە ژیان لەپێناو ژیانێکی دیدا. ژیانێکی تر دەچێتە پاڵ مردووان، تاکوو ماڵ و باخچە چێ بکەن و تێیاندا نیشتەجێ ببن.

دەشێت ژیانەکەی دی تەنیا بەدیهێنانی خەونە کۆنەکان بێت. لەوانەیە هەر مردوویەك ئەوە بنیات بنێت لە ژیانی یەکەمی نادادپەروەرانەیدا ئاواتی دەخواست بنیاتی بنێت. باوکم لەوێ دێتە بەرچاو، بەردی قسڵ کۆ دەکاتەوە وماڵۆچکەیەك لەسەر گردێك دروست دەکات. یاخود تەورێك بە دەستەوە دەگرێت، تاکوو لە تاشەبەری گردەکە ماڵێك هەڵکۆڵێت لە ماڵەکەی کوینکای بچێت. ئەو ماڵەی کوینکا کە پێشتر نەمدیبوو، کەچی سەرەڕای ئەوەش لەسەرمە وەکوو فەرزێکی ئیلاهی لێی بگەڕێم و بیبینم.

مردووانیش دۆزەخ بنیات دەنێن. هەندێکیان وەکوو پەیامێك خۆی بۆ دارخڕکردنەوە تەرخان دەکات، هەندێکیشیان بۆ دروستکردنی شەمچە، هەندێکی تریشیان بۆ بەنزین بەسەرداکردن. سەدان ساڵە مردووان هەمان کار دەکەن، تاکوو دۆزەخ و بەهەشت بە پاڵ یەکەوە بن، بۆ ئەوەی مردووانی تازە بێن لە یەکێکیاندا بمێننەوە، یاخود پانتایی هەر کامێکیان گەورەتر بکەن. لەوانەیشە دۆزەخ و بەهەشت یەك شت بن. هەمان ڕووبەر کۆیان دەکاتەوە، لە هەمان ڕووبەریشدا هەست بە خۆشگوزەرانیی یەکیان دەکەیت، یاخود دۆزەخی ئەوی تر. بەهەشتی هەندێك ئاگری بڵێسەدارە، دۆزەخی هەندێکیش بەهەشتێکی هەتاهەتاییە.

من لەو ڕۆژانەدا باوکمم ناسی. ڕوخسارێکی نوێم بینی بە بینینی ڕانەهاتبووم. لە بەردەممدا خواپەرستییەکی دەنواند تا ئەوپەڕی توندڕەوی. لە دوا ڕۆژەکانماندا چی دەبینین؟ چۆن لە دەڤەری پیرییەوە بۆ ژیان بڕوانین؟ چۆن لە کەناری ژیانەوە لە ژیانی نوێ بنۆڕین؟ ئایا ئەو چل ڕۆژەی دوایی کێوی ئەعرافە

لە نێوان دوو ژیاندا؟ باوکم چون چۆلەکەیەك بێچووەکەی فێرە فڕین بکات، کاغەزەکانیم ڕادەست دەکات، لێ جیاوازیی ئەوەیە کۆچی باوکم پێش ئەوە دەبێت باڵەکانم پەڕ بگرن و هەڵمبگرن. باوکم کاغەزەکانی خۆیم دەداتێ، تاکوو لە باری ژیانی یەکەم ڕزگاری بێت، بە ڕۆح و جەستەی تەرخان بێت بۆ باری دووەمین ژیانی خۆشیی.

زەردەخەنە شێواوەکەی باوکم لە ڕاستیدا ڕووی لە جیهانێکی تر بوو من نەمدەبینی، تەنیا بەڵێنێك بوو بۆ من بە سازکردنی ژیانەکەی دی لەپێناو مندا. مردووان لەوێ تاکوو کۆتایی دنیا کار بۆ بنیاتنانی بەهەشتەکان دەکەن، چەندێك وەجبەی تازەی مردوو بگەیشتایا، بەوپەڕی ئازادییەوە خۆی بۆ کارێکی نوێ تەرخان دەکرد، لە هەمان کاتدا ئەوی مردووانی پێشوو دروستیان کردبوو مایەی خۆشیی ئەم بوو. ئەو مردووانەی لەبەر ئەوەی لە دەرەوەی زەمەنن، پاش ئەوەی لاوییان بۆ گەڕایەوە، نازانن پیری چییە. باوك و باپیرانم لەوێ وابوون، بەم ئاوایە منیش بە دڵنیاییەوە پێیان دەگەم، تاکوو لە کۆتایی دنیادا مردووان لە جیهانەکەی تردا بە یەکتر بگەن، ئیدی بەهەشت بێت، یاخود دۆزەخ لە چاوەڕوانییاندا دەبێت.

دەستم بە وەرگێڕانی دەستنووسەکان و سەرلەنوێ نووسینەوەیان کرد، بە زمانێك هەوڵم دەدا پێی دەنگەیلێك بخوازم نایانزانم، کەچی خوێنیان بە خوێنمدا ڕێ دەکات و نازناوم بە نازناویان کۆتایی دێت. دەستە لەرزیوەکانم چەشنی دەستی پەیکەرتاشێکی تازەکار بوون داوای لێ کرابێت پەیکەرێك لە بەرد بتاشێت. وشەکان بەرد بوون، منیش هیچ پەیکەرێکی شێواو نازانم بتوانم دروستی بکەم.

پەیڤەکانی باوکم تەنیا ئاراستەی من نەبوون، دوای چەند ڕۆژێك دەرکم کرد ئەو مردووانی تر دەبینێت، ئومێدیان لەگەڵدا دەگۆڕیتەوە و یادەوەرییەکانیان لەگەڵدا باس دەکات. ئەوان بەیانیان و ئێواران لێی خڕ دەبوونەوە، لە کاتی خەوە درێژ و پچڕپچڕەکانیدا دەیانخلافاند. کاتێك خەریکی جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکەی بووم، بە بێدەنگی ماڵئاواییم لێ کرد. ئاخۆ ئەوە ئێمەین دەچین بۆ مەرگ، یاخود مەرگ بۆ لامان دێت؟ ئایا لە وێنەی بوونەوەر خۆیمان نیشان دەدات، یان جیهانێکی پەنهانە بۆ ئەوێ دەگوازینەوە؟ باوکم دەیگوت، بۆنی عەترێکی خۆش دەکات. دەیگوت: مردن باش پێشوازیی میوانە هەتاهەتاییەکانی دەکات. دەیگوت: هێشتانەکینێ مردن بە خوێنی ژیان نەلەوتاوە. داخۆ هاوەڵە مردووەکانی دەدیت تۆوەکە لە زەوی دەوەشێنن؟ ئایا کەسیانی بینی میوە لە دار بکاتەوە؟ چما زانی، پێش مردنی، چ کارێك لە ژیانی دووەمدا دەکات؟

بەیانیانێکیان گوتی لەگەڵتدا بە هەندێك لە دەستنووسەکاندا دەچمەوە. من ئەوەم وەکوو بەڵێن وەرنەگرت، ئاخر نەمزانی ئاخۆ ئەو قسەیەی ئاراستەی من کرد یان بۆ ئەوانگەلێك نایانبینم. هەروەها نەمدەزانی، داخۆ ئەو قسانە بۆ منن، چۆن دەتوانێت ئەوە بکات ئەگەر ڕۆحی فڕیبێت و چاوانی ڕوو لە شوێنێکی تر بن.

# 20

**کوڕە ئازیزەکەم...**

لە ڕۆیشتندا وەلام، لە گەڕانیشدا دۆزینەوەی ڕاستی هەیە. ڕێگەت بۆ خۆش دەکەم ڕێ بکەیت، بەلام لە ڕۆیشتنەکەتدا هاوشانت نابم. یەکەمین شت دەبێت بیزانیت ئەوەیە، دایکت لە "قەلای خۆلین" لەدایك بووە، زۆر مەزەندە دەکرێت ئێستاش لەوێ بژی.

ئەگەر نەتدەزانی، ئەوا بزانە: قەلای خۆلین دەکەوێتە خوارووی ئیسپانیاوە، بەدوای شاری جەییاندا دێت، ئەوی ناوی بووە خئاین. دواتر دەزانیت جەییان دوای ئەوەی کەوتە ژێر تاجی کاسۆلیکی، بووە بالێك بۆیان بۆ ڕاوەدوونانی باپیرانمان، بۆیە پاشا ناوی "شارە خانەدانەکە"ی لێ نا. هەندێك قەلای عەرەبی هەبوون تەنیا داروپەردوویان ماوە. بەلام قەلای خۆلین چیرۆکێکی تری هەیە، کێلگە زەیتوونەکانی، کوڕی خۆم، بەزەییان پێماندا دەهاتەوە. خەلکەکەی کەسوکارمان بوون. ئێستا وەکوو شتەکانی دی ناوی گۆڕا و بووە "ئیزناتۆراف"، لێ گۆڕانی ناو گۆڕانی مێژوو ناگەیەنێت. هەروەها دەبێت ئەوە بزانیت، مانای گۆڕینی ناسنامە نییە.

ڕەنگە لە مالی کەسوکارەکانمان کاغەزی تریش ببینیتەوە. ژێر مالەکان ژێرخان و گەنجینەن. ئەگەر گەیشتیت، بگەڕێ. ئەگەریش دۆزیتەوە، بیپارێزە. ئەگەریش کەوتیت، ئەوا خوا کەریمە.

# 21

## کاغەزەکانی محەمەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی محەمەد دی مۆلینا

## کۆنکە/ پایزی ١٤٩٢

### (1)

من ئەم چەند پەڕەیە دوای چەند هەیڤێك لە کەوتنی غەرناتە دەنووسم. دوای دانەدەستەوەی عەبدوڵلا سەغیر کلیلی مەملەکەتەکە بەدەست هەردوو پاشای کاسۆلیك فرناندۆ و ئیسابێل. من لە شاری کۆنکەوە دەنووسم، لێرەوە بەدواداچوون بۆ ئەو ڕووداوانە دەکەم دەبوو ڕوو بدەن. بەدوایاندا دەچم و دەزانم چی ڕوو دەدات. دەزانم، چونکە لە شارۆچکەکەماندا ئەمە ڕووی دا و ڕوو دەدات.

لە کۆنکە، ساڵانێکی زۆر پێش ئەوەی غەرناتە بکەوێت، لە ئەندەلووسییەوە گۆڕاین بۆ مودخار، لە مودخاریشەوە بۆ مۆریسکی. سەرەڕای ئەوەی پەیمانی نێوان ئەبو عەبدوڵلا سەغیر و پاشا کاسۆلیکییەکان بڕیار لەسەر مانەوەی موسوڵمانان و ئازادیی بەڕێوەبردنی دابەکانیان دەدات، لێ من دوای ئەوەی گەیشتمە ئەم تەمەنە، زانیم بەڵێنەکان چەشنی بەفرن، هەر هێندەی هەتاو ببینن دەتوێنەوە.

ئێستا ئەم کاغەزانە بەپێی وەسیەتنامەکەی باوکم دەنووسم. وەسیەتنامەیەك بۆ منداڵەکانمی جێ دەهێڵم. دەنووسم، چون نووسیان و دەنووسن، چونکە یادگە وێرانەیە، نووسینیش نۆژەنکردنەوە. وێڕای ئەوەی من مێژوونووس نیم و دانپێدانان بە ڕاستیدا ڕەندییە، من لەوانە نیم خوای مەزن توانای گێڕانەوەی ڕووداوەکان و شیکردنەوەی پێ بەخشین، پیاوێکم گرینگیش نیم، تاکوو یەکێك بایەخ بە خوێندنەوەی ئەوی دەینووسم بدات، بەڵام بڕوام وایە، خودا شایەتە، ساڵنامەکان جێگرەوەی قسەن. لەبەر ئەوەی ئێمەی ڕۆڵەی کۆنکە، دەزانین چی ڕووی داوە و چی ڕوو دەدات، ئەوەتا ڕۆژەکان دووبارەبوونەوەی ڕۆژەکانن و ڕووداوەکان پاتەی ڕووداوەکانن، بۆ کەسیش ڕەوا نابێت شتێك بلێت بە دڵی پاشا نەبێت، خۆم دەبینم ناچارم، ناچارییەکی ئازاد، بەپێی توانا ئەوی بتوانم بینووسمەوە. لەوەدا تەنیا خوازیاری ڕازیبوونی پەروەردگارم، چاویشم لە هیچ نییە ئەوە نەبێت نەوەکانم بزانن ئەمە خاکی ئێمەیە، تێیدا هاتینە دنیاوە و تێیدا دەمرین. هیچ خاکێکیش هێندەی ئەم شارە لە دڵماندا شیرن نییە.

بەهەرحاڵ، چاوم لێ نییە و بە هیچ شێوەیەك نامەویت ببمە کۆڵەکەیەکی مێژوویی. ناشمەوێت نووسینەکانم بەسەر ئەهلی زانست و پسپۆڕیدا بڵاو بینەوە. ناخوازم بە باش و خراپ ناوم بێت. حەز دەکەم، لەوە زیاتر هیچم ناوێت، ئەوە بنووسم لە ویژدانمدا پێویستیی نووسینی ڕەگ دابکوتێت. ئەوەش بە نهێنی بهێڵمەوە. بە نهێنی بیهێڵمەوە تاکوو ئەو دادگاییانە نەبینم، وەك ئەوانەی بە چاوی خۆم بینیمن. هەروەها بە نهێنی بیهێڵمەوە تاکوو دەسەڵاتداران لە دەستمی نەکەنەوە و بەوە هەمووم

لەدەست بچێت. بە نهێنیی بێت، چونکە دەبێت کاغەزەکان بگەنە دەست نەوەکانم و نەوەی نەوەکانم. ئەوە جێماوی منە بۆیان، هەروەها میراتیشم پێشکەشیان دەکەم ئەگەر نرخی بزانن. نووسینەکان پەیامن، ئەگەر بە ئامانجی خۆیان نەگەن ئەوا مانای خۆیان لەدەست دەدەن. چونکە خوێندنەوە بە زمانێك نەیزانیت بێهوودەیە. ئەو وشانەش ماناکانیان نەزانین تەواو بەتاڵن.

لە کۆنەوە دەڵێن، ڕاستی کۆمەڵێك ڕاستییە، تەفسیریش کۆمەڵێك تەفسیرە. هیچ شتێك هێندەی ئەوە لەسەر دڵ گران نییە، قسەیەك بکەین بزانین درۆیە. هیچ ڕێگەیەکی تەخت و زەوییەکی ڕاست نییە، ئەگەر ئاستەنگ و لەمپەری تێدا نەبێت بە خەیاڵدا نەهاتوون. ڕەنگە ڕاستیی لەمێژینان دنەی گەڕانم بدەن بە دوای ئەوەی دەیڵێم. لەوانەشە ئاسانیی نووسین هانی ئاگەداریی فێڵی کەوتنە ناو هەڵەوەم بدات. مرۆڤ وشەیەك ئاراستە دەکات وەك ئەوەیە بەردێك تێ بگرێت، ئەگەر بەر کەوت ئەوا پێکاویەتی، ئەگەریش بەری نەکەوت ئەوا لێی نەداوە. وێڕای ئەوەی وەك هەموو بنیادەمێك هەڵە دەکەم، بەڵام حەزم بە هەڵە و گوناە نییە. هەروەها خۆم بە بەرکەماڵ و بێهاوتا دانانێم. مرۆڤ هەرگیز بانگەشەی شتی وا ناکات تەنیا مەگەر دژەکەی بەرکەماڵ بێت. لەبەر ئەوەی من چاوم لە پاڵەوانیی نییە و دووی جاویدانی ناکەوم، کاتێك دەنووسم خۆم لە گشت خراپەکانی دەروون ڕزگار کردووە، بەو مەبەستەی بیگەیەنم بە نەوەکانم، خوا شایەدە لەسەر ئەوەی بینیم و بیستم. ڕەنگە یەکێکی دی وا نەڵێت. لەوانەیشە ئەوانی دی حەز بە شێواندن بکەن، یان ئەو شتە تۆمار بکەن ڕووی نەداوە وەك ئەوەی ڕووی دابێت. یاخود ئەوی ڕووی داوە چون ڕووی نەدابێت. ئەگەر بزانن، لەمەدا

تاریکیی گومڕایی و گومڕایی تاریکی هەن.

دەتوانیت بێژیت، هەڵبەت قسەکانم بۆ تاکە ئەگەرچی زۆرن، من یادەوەریی دەنووسم. یادەوەرییەك ڕەنگە لە ڕۆژگارێکی تردا پێویستی بە نۆژەنکردنەوە بێت. یادەوەرییەك، چاوم لەوەبوو وەکوو حەکایەتی میللی بە نێو خەڵکدا بڵاو بێتەوە. حەکایەتێك داپیران بۆ ڕۆڵەکانیانی بگێڕنەوە. حەکایەتێك کیژان لە شەوانی سارد، لە شەوانی تاریك، لە شەوانی درۆدا لە نێو خۆیاندا بیگێڕنەوە. ئاخر مێژوویش کەسی خۆی و کتێبی خۆی و نووسەری خۆی هەن، یادەوەرییش کەسی خۆی و حەکایەتی خۆی هەن. ئەگەرچی بانگەشەی ڕاستی ناکەم، ڕاستی کۆمەڵێك لە ڕاستییەکانە، لێ من حەکایەتی خۆم هەیە. ئەگەر ڕاستیی نەیپێکا، ئەوا بمبەخشن هەوڵی خۆی دا.

## 22

ئەگەر دەزانیت چەند خەم دەخۆم

بە بەزەییتر دەبووی لەوی دڵیدایەوە و بەخشی.

# 23

## کاغەزەکانی محەمەدی کوڕی عەبدوڵلا دی مۆلینا
## کۆنکە/ ١٤٤٣

(2)

بە ڕێگەوە بووم بەرەو دوکانی ئاسنگەرییەکە. وەکوو هەر ڕۆژێکی دی سەرنجی ماڵە نزیکەکانی ئەبی عەبدوڵلام دەدا. وەکوو بیرۆکەیەکی دوور، بیرم کردەوە، تاسەیان دەکەم. ئەو ماڵە نزمانە، بە بانیژە بچووکەکانیانەوە، یادەوەریی منیان هەڵگرتووە. پتر لە جاران لێیان ڕامام، بە دەنگێکی دەرنەچوو سڵاوم لێ کردن. بەدەم ڕۆیشتنی خێراوە لە باخەکانمان نزیك بوومەوە. کاتێك بیرم کردەوە کەمەك سەیرم هاتێ لەوەی باوکم مکوڕە لەسەر ئەوەی ئاسنگەریی فێر بین.

گوتم، من بە ڕێگەوە بووم بەرەو دووکانی ئاسنگەرییەکە. سەرلەبەیانیی زوو بوو. هێشتا هەتاو لە ئاسۆ دەرنەکەوتبوو. ئاسمان مژدەی بارانێکی بەخوڕی دەدا. زستانەکەی زستانێك بوو، دەست و پێی دەڕچاند، پتر لەوەی جەستە لاوازەکەی من بەرگەی بگرێت. لاواز سەرەڕای توانام بەسەر ئاسنگەریدا. لە بەرزاییەکان ڕامابووم. لە ماڵە تاشراوەکانمان لە بەرد. ماڵە هەڵواسراوەکانمان بە گردەکانەوە چەشنی پەنجەرە. من بە پێ

بەو بەرزاییبانەدا سەر دەکەوتم. بای سپێدەی زستان خۆی بە سیەکانمدا دەکرد. سیەکانمی دەسمی و وزەی ئەوینی پێ دەبەخشیم.

باسی ئەوەم دەکرد بە ڕێگەوە بووم بەرەو دوکانی ئاسنگەرییەکە، پۆلیسێك لە بەردەمم قوت بووەوە، یەکدیمان دەناسی. ڕۆژانە سڵاومان لە یەکتر دەکرد و هەندێك جار لە دوکانەکەمان دادەنیشت. لەگەڵ ئەوەشدا خۆی لێمان نەناس کرد. بە دەنگێکی وشك لێی پرسیم، بۆچی پۆشاکە سەوزەکەم لەبەر نەکردووە. سەرەتا وام زانی، کەمێکیش بێئومێدی دەکردم، شۆخیی دەکات. بزەیەکم کرد و پێم گوت: چونکە سەوز زەرد دەبێت و لە درەخت بەر دەبێتەوە. گوتی: شۆخی ناکات، فەرمانێکی پاشایی دەرچووە، دەبێت هەموو مودخاران جلی کەسك بپۆشن. من دەمزانی کابرای پۆلیس پیاوی دەسەڵاتە. یارۆی پۆلیس ڕای خۆی دەرنابڕێت، ئاخر پۆلیس بێ ڕان. یارۆی پۆلیس گوزارشت لە ڕای ئەوانە دەکات لێرە دایانناوە. ئەوی باوەڕی وابێت، هەڵبەت هەقیەتی، ئەو بەرگرییان لێ دەکات، ئەو داردەستە، بۆیە گلەیی لێ ناکەم، کێ دەتوانێت گلەیی لە داردەست بکات؟

باسی ئەوەم دەکرد بە ڕێگەوە بووم بەرەو دوکانی ئاسنگەرییەکە، لەودەمەدا بریسکەیەکم بۆ هات. کاتێك هەستم بە شکانەوە کرد. ئەوە بوو بای بەرەبەیانی زستان لە سنگمدا پەنگی خواردەوە. شتێکم نەبوو بە پۆلیسەکەی بڵێم، ئەوی دووبارەی کردەوە دەبێت بچمەوە ماڵ و پۆشاکی کەسك لەبەر بکەم.

شتێکم نەبوو بە یارۆی پۆلیسی بێژم، ئەودەمی فەرمانی پێ

کردم، بە خانەوادەکەم و سەرجەم دراوسێ مودخارەکانم ڕابگەیەنم، ئیدی دەبێت جلی تازەمان کەسك بێت. کاتێك گوتی فەرمانی پاشایی دوێنێ دەرچووە و گەیشتووەتە ناوچەی کۆنکە. گوتی: سەیری دێت چۆن بە فەرمانەکەمان نەزانیوە.

باسی ئەوەم دەکرد بە ڕێگەوە بووم بەرەو دوکانی ئاسنگەرییەکە، ئەوە بوو ناچار بووم بگەڕێمە ماڵەوە. ئەودەم هەستم کرد ڕێگەی گەڕانەوە درێژ بووەتەوە. ئەوە بوو شەرم دایگرتم و حایر مام چۆن فەرمانی پاشاییەکە بە باوکم ڕابگەیەنم.

لەو دەمەوەی کۆنکە و تولەیتولە و شارە موسوڵمانەکانی دی کەوتنە ژێر تاجی کاسۆلیکەوە، بەر لە پتر لە سەت ساڵ، بووینە مودخار. بەڵام وەکوو مودخارێك کاری کڕین و فرۆشتنمان دەکرد. تێکەڵ و گونجاو بووین و ژن و ژنخوازیمان هەبوو. کاری دەستیی خۆمانمان دەکرد و بە هەمان دەستیش زەوییەکانمان دەکێڵا.

باسی ئەوەم دەکرد بە ڕێگەوە بووم بەرەو دوکانی ئاسنگەرییەکە، بۆم دەرکەوت قەڵا سەختەکەمان جگە لە قەڵایەکی خۆڵین هیچی دی نییە.

# 24

**برای ئازیز: عەبدوللا**

**سلاو و ڕێز**

برا گیان، ئەوەتانێ ڕۆژەکان تێدەپەڕن، تاکوو خۆمان بە پۆشاکی کەسکەوە ببینین، وەك تووشبووان بە گەڕی لە شوێنێکدا کۆ کراوینەتەوە. ئەگەر باوەڕمان هەبێت ئەم ڕۆژانە دەستاودەست دەکەن، هەست بە تالّییەك لە گەروومان‌دا دەکەین. ئایا پێویستە لە بەردەم باپیرانماندا هەست بە شوورەیی بکەین؟ یاخود بۆ نەوەکانمانی پاشەکەوت بکەین؟ ئایا دەبێت بڕوا بەوە بهێنین نەفس هەموو خراپەیەك بە بنیادەم دەکات، خۆشگوزەرانەکان بەدفەڕی و خراپەکارییان کرد، ئێمە باجەکەیمان دایەوە؟ یاخود وەکوو ئیبن عەرەبی دەڵێت، دەبێت بڵێین، هەر ڕەوشێك دوو ڕۆژگار دەوام بکات پشتی پێ نابەسترێت؟

بزانە برام، ململانێی نێوان دەسەڵاتبەدەستان لەسەر دەسەڵات شەڕانگێزییە، بەڵام لەوەش شەڕانگێزیتر ئەوەیە ئێمە ببینە سووتەمەنیی ئاگردانەکە. من کاتێك هەست بە شەرمەزاری و سەرشۆڕی دەکەم، باسی ئەو بڕیارەت بۆ دەکەم داومە بە سینگفراوانییەوە وەریدەگریت، دەزانم ژیان چاڵوچۆڵییە، هەر یەکێك لە ئێمە ئەو چاڵە هەڵدەبژێرێت تێدا جێی دەبێتەوە.

سەرلەبەیانیی ئەمڕۆ، لەگەڵ شریخەی بەیاندا و بێ هیچ ڕێککەوتنێکی پێشوەختە، من و مەریەم بیرۆکەیەك لە زیهنماندا خەملی، کۆچکردن بەرەو "جەییان" و جێگیربوون لە قەڵای خۆڵین. جڕوجامشتەکانمان کۆکردنەوە و کیژەکانمان لە خەو بێدار کردنەوە و ئەم نامەیەم بۆت نووسی و ڕۆیشتین. هەموو شتەکان لە ناکاو هاتن، وەك ئەوەی جادوومان لێ کرابێت جووڵاینەوە. لە ناخی هەر یەکێکماندا پاڵنەری نەبینراو هەبوو، ڕێگەی خۆش دەکرد.

بەڵام برا بزانە، ڕەنگبێت بشزانیت، جەییان هێشتا لە کۆنکە و تولەیتولە باشترە، نزیکیی لە غەرناتە و لە کەسوکارمان ئەگەر زەحمەتیی کەمترت پێ نەبەخشێت، ئەوا هەستی گەورەترت لە ڕابواردن و دڵنیایی دەداتێ. برا، لە قەڵای خۆڵیندا، کەسوکاری مەریەم لە باخی زەیتووندا کار دەکەن. ئەگەر لە کشتوکاڵ کار نەکەین، ئەوا ئاسنگەریی دەکەین، ئەوەش پیشەی باپیرانمانە، یاخود لە بۆنفرۆشی کار دەکەین، وەك چۆن لێرە کار دەکەین. لێ لەبەر ئەوەی دروست نییە بڵێیت "جارێکی دی لەم ڕووبارە ئاو ناخۆمەوە"، لەگەڵ ئەم نامەیەدا کلیلی ماڵەکەمان و کلیلی دوکانی بۆنفرۆشییەکەت بۆ جێ دەهێڵم. ئەگەر باش بوو ئەوا باشتر، ئەگەریش خراپ بوو ئەوا دەگەڕێینەوە.

**برات: یونس**

**کۆنکە/ ١٤٤٨**

# 25

## کاغەزەکانی محەمەدی کوڕی عەبدوڵلا دی مولینا

## کۆنکە ١٤٤٥

### (3)

کاتی نیوەڕۆ، ئەودەمی بە هێوری بە شەقامەکەدا پیاسەمان دەکرد، بۆ نانی نیوەڕۆ و سەرخەوشکاندنێك دەگەڕاینەوەماڵەوە، یەکێك لە برادەران باسی پاشای قشتاڵە و لیۆنی بۆ کردین، فەرمانێکی بۆ والیی کۆنکە ناردووە، فەرمانی پێ دەکات مودخارەکان لەم شارەدا دەربکات.

ئێمە تەنیا پێنج خێزان بووین، ئەوی باری کرد باری کرد و ئەویشی مرد لە داخ و مەراقدا مرد. ئەگەر جلە کەسکە تایبەتەکانمان نەبووایا کەس بیری ئێمەی نەبوو، نەك لەبەر کوشتنمان، بەڵکوو لەبەر سیماشمان لە ڕەنگی خاکەکەی دەکرد. ژن و ژنخوازیمان کرد و خوێنمان تێکەڵ بوو، هەرچەند سەرچاوەکان جیا بوون. کوێخا لە وەڵامدانەوەی نامەکەی پاشادا دەقاودەق وای گوت. هەروەها گوتی، مودخارەکان نهێنیی پیشە دەستییەکانیان لایە، ئاماژەی بە خانەوادەکەم دا، کە لە ئاسنگەری کار دەکەن و خزمەتی

شارەکە و ئاواییەکانی دەوروبەر دەکەن. وا دیار بوو پاشا ژمارەی ئێمەی نەدەزانی، بۆیە لە دەرکردن تێپەڕی و فەرمانی دا وەك شوێنانی دی موسوڵمانان باجیان لەسەر زیاد بکرێت و باجی دووقات بدەن، کوێخا بەرپەرچی دایەوە، شوێنەکانی دی باجی پتر دەدەن، چونکە ژمارەیان زیاترە، هەرچی کۆنکەیە ئەوا ژمارەی مودخارانی تێدا کەمە، ئەو باجەشی دەیدەن زۆر زۆرە.

ئەوی کوێخا گوتی ڕاستیی تەواو بوو، لە مەملەکەتە ئیسلامییەکانی تردا، ئەوانی کەوتبوونە دەست پاشا کاسۆلیکییەکان، موسوڵمانان باجی کۆکراوەیان دەدا. داوای بڕێکی دیاریکراویان لێ دەکردن، ئیدی بە کۆمەڵ خڕیان دەکردەوە و دەیاندا. لەبەر ئەوەی ژمارەیان زۆر بوو، هەر تاکێك بەپێی توانای خۆی دەیدا. هەرچی ئێمە بووین، باوکم باجی خانەوادەکانی دی خڕ دەکردەوە، بە زەحمەت ئەوی دەکەوتە سەرمان پێمان دەدرا، چونکە دڵنیا بووین شێوازێکە بۆ هەراسانکردنمان، تاکوو خاکی خۆمان جێ بهێڵین.

## 26

**برام یونس...**

کاتێك نامەکەتم خوێندەوە و زانیم کۆنکەت جێ هێشتووە، خەم دایگرتم. ئاخر برام چۆن دڵت هات خاکەکەمان جێ بهێڵیت؟ من دەزانم لە "قەڵای خۆڵین" لەگەڵ کەسوکارماندا سەلامەتی، ئەوەش دەزانم کەسوکاری ژنەکەت پێشوازیی گەرمتان لێ دەکەن، لێ من ڕام لەسەر ئەم ڕاگوێستنە نییە. ئاخر ئێمە ڕۆڵەی کۆنکەین. لێرە لەدایك بووینە و باپیرانیشمان لێرە هاتوونەتە دنیاوە. کۆنکە پێش هاتنی ئێمە هیچ نەبوو. ئەوە ئێمە بووین قەڵامان تێدا بنیات نا و خانوومان لە تاشەبەردەکان هەڵکۆڵی. ئێمە بووین خاکەکەیمان چاند و درەختەکانیمان بەرهەم هێنا. ئێمە بووین بە دەستی خۆمان هەردوو ڕووبارەکەیمان خاوێن کردەوە. برام، خەڵکی کۆنکە کەسوکاری ئێمەن، تەنانەت ئەگەر پاشا و سوڵتانەکانیش ستەم بکەن، تەنانەت ئەگەر ململانێیان لەسەر تەختی لەدەستچوویان گەیشتە خوێنڕشتن. ئێمە و دراوسێکانمان، ئەگەرێکوو لە بیروباوەڕیشدا جیاواز بین، ئەوا کەس و برای یەکترین. لە ڕۆژانی داهاتوودا دەزانیت چۆن لویس و ئینماکۆلادا و مانوێلای کچیان خەمیان بۆ دابڕانت خوارد، سڵاوی گشت دراوسێکانت بۆ دەنێرم، ئەوانەی خۆت و هاوژین و کیژەکانتیان خۆش ویست.

لەم نێوەدا لۆمەت ناکەم برا لەوەی کۆچت کرد، لێرە ژیان سەختە. بەڵام بە خودای جگە لێرە هیچ خاکێکی تر ناناسم، ڕەگیشم نییە تەنیا لە قووڵایی کۆنکە نەبێت، کە هەڵکێشانی زەحمەتە، ئەگەر هەڵکێشرا ئەوا خوێنبەربوونەکەی ناوەستێت. هەروەها دەزانم لەگەڵ ئەستەمیی گوزەراندا، پەڵە هەورێکە و دەڕەوێتەوە. هەر بە بۆنەی ئیبن عەرەبییەوە، ئەوەشت بیر دەهێنمەوە، گوتوویەتی: "ڕازیبوون بە قەزای خودا پشتی پێ نابەسترێت".

لە کۆتاییدا، تۆ لەوی بۆی ڕۆیشتی هەقی خۆتە برا، هەر ئێمە باجی هەڵەی فەرمانڕەواکانمان دەدەینەوە. ئەوان جیا بوونەوە و ستەمیان کرد، ئەوە بوو مەملەکەتەکانیان کەوت، هەوڵی دوای تالانییان دا وەکوو چۆن پێشینان لە شەڕی ئوحوددا کردیان. قووڵیی پەیامەکەیان لە بیر کرد و توێکڵەکەیان وەرگرت، خواش لە بیری کردن. ئاوەزیان بەکار نەهێنا و دوای گومڕایی کەوتن. گوێیان لە ئیبن عەرەبی و ئیبن حەزم و ئیبن ڕوشد نەگرت، دوای شمشێر کەوتن و خوێنیان ڕشت. پاساویان بۆ کارەکانیان دەهێنایەوە، پێیشیان لەسەر ملی ئێمە گیر کردبوو. ئەمڕۆش کەشتییەکە نغرۆ دەبێت، ئەگەر نوقوم بوو ئەوا هەمووان لە مەرگدا یەکسانین.

ئیدی پشتوپەنامان هەر پەروەردگارە.

**برات: عەبدوڵلا**

**کۆنکە ١٤٤٨**

## 27

### له كاغه‌زه‌كانی عه‌بدوللا دی مۆلینا

### كۆنكه/١٤٧١

ڕۆله‌كانم، ئه‌مڕۆ كۆم كردوونه‌ته‌وه، تاكوو ئه‌و مه‌ترسییه‌تان پێ ڕابگه‌یه‌نم هه‌ڕه‌شه‌مان لێ ده‌كات. ژیان وه‌كوو جاران ئه‌مان نییه. ڕۆژانی دواتریش باشتر نابێت. ئه‌وه‌تان پێ ده‌ڵێم خۆتان ده‌یزانن. زوو بێت یان دره‌نگ ولاتی موسوڵمانان به‌یه‌كجاری ده‌ڕووخێت، خۆتان پێ ده‌زانن و ده‌یبینن. له كه‌وتنی توڵه‌یتوڵه‌وه بۆ ژێر تاجی كاسۆلیكی ده‌یزانن. ته‌نیا غه‌ڕناته ماوه‌ته‌وه، خۆفرۆشیی فه‌رمانڕه‌وایانی موسوڵمان و ڕاكردن به‌دوای ده‌سه‌لاتی دوژمندا بۆ خۆدانه‌پاڵی و سه‌ركه‌وتن به‌سه‌ر برایانیان تاقه ئاكامی له‌ده‌ستدانی هه‌مووانه، له‌ده‌ستدانی هه‌موو شتێك.

ڕۆله‌كانم، من بۆیه ئه‌وڕۆ كۆم كردوونه‌ته‌وه تاكوو پێتان ڕابگه‌یه‌نم، ئێمه چه‌وساوه‌كانی سه‌ر زه‌ویین، ئێمه كه‌س گوێی لێمان نییه و كه‌سیش گوێمان پێ نادات. مادامه‌كی كاره‌كه وایه و ده‌ركی پێ ده‌كه‌ین، ده‌بێت له ژێر ماڵه‌كانماندا ماڵ لێ بده‌ین، دالان و ژێرزه‌مینی تێدا هه‌ڵكۆڵین. له ژووره‌كانی

خوارەوەدا چی شتی بەنرخمان هەن دایانبنێین. ئەگەر پاشایانی کاسۆلیك دژی ئێمە زیاتر لە ئێستا توندوتیژییان نواند، ئەوا پەناگەمان هەیە. ئەگەریش ڕۆژێك دەریانکردین، ئەوەمان بۆ نەوەکانمان پاراستووە دەبێت وەکوو میراتیی ئێمە پێیان بگات. لەو نێوەدا، لە کاتی ژیانکردن و هەلکۆلیندا، بیرتان نەچێت ئەم ڕۆژانە تۆمار بکەن، ڕۆژێك دێت لەسەر خەلکە قسەی هەق بلێین، بۆیە ئێوەش هەمیشە لەسەر هەق بن.

لە کۆتاییدا، کەس هەلتاننەخەلەتێنێ بەوەی کاسۆلیکییەکان حەز لە موسولمانان ناکەن، هەروەها ئەوەی کاسۆلیکان هەولی وەدەرنان و کوشتنی موسولمانان دەدەن. بڕوانە قوولایی ئەوی لەسەر ڕووی زەوی دەیبینن، هەقیقەتی شتەکان ئەوە نییە کە بەبەرچاوەوەن. تەماشاکەن تاکوو ببینن ئەوە پاشایە کلێسا دەجوولێنێت، نەك کلێسا پاشا بجوولێنێت. بڕوانن چۆن ئامانجەکانی پاشای کاسۆلیك لە دەسەلات و پاوانکردن و فرەوانبوونەوەدا کورت دەبنەوە، کلێساش تەنیا ئامرازێکە. ئەو کلێسایەی بە ناوی پەروەردگارەوە قسان دەکات، پتر لەو پاشایە لایەنگر کۆ دەکاتەوە بە ناوی نیشتمانەوە دەدوێت. قوربانییش "کافر" هێندەی قوربانییەکی خۆفرۆش سۆز بەدەست ناهێنێت. بەم ئاوایە ویژدانمان دەپشکنن، تاکوو پارە و سامانمان لەدەست بکەنەوە، نەك وێنەی ئایکۆنی پیاوچاکان لە دلماندا بکێشن.

## 28

نحـل مـا كـان معقـودا بانفسـنا، وانبـت مـا كـان موصـولا بايـدينا
قـد نكـون، ومـا يخشـى تفرقنـا، فـاليوم نحـن، ومـا يرجـى تلاقينـا
ليت شعري، ولم نعتب اعاديكم، هـل نـال حظـا مـن العتبـى اعادينـا
م نعتقـد بعـدكم الا الوفـاء لكـم رايـا، ولـم نتقلد غيـــره دينـــا[١]

**(ابن زيدون)**

---

[١] چیرۆکی ئەم چامەیە: ئیبن زەیدوونی وەزیر و وەلادەی کچی ئەلموستەکفی یەکدییان خۆش دەویست. کاتێك ئەبو عامری وەزیر پێگەی ئیبن زەیدوونی لای وەلادە پێ زانی، چونکە خۆیشی وەلادەی خۆش دەویست، بۆیە بڕیاری دا تەڵەی بۆ بنێتەوە، تاکوو لەسەر ڕێگەی خۆی لایبدات. ئەوە بوو ئیبن زەیدوونی لە وەزیریی دوورخستەوە و خستیە زیندانەوە. دوای هەڵاتنی ئیبن زەیدوون لە زیندان خۆشەویستیی بۆ کیژە پتر بوو، بەڵام گڕی ئەو ئەوینە لای کچە خامۆش بووەوە. بۆیە ئیبن زەیدوون ئەم چامەیەی بۆ نووسی. (وەرگێڕ)

# 29

## له كاغەزەكانی محەمەدی كوڕی عەبدوڵلا دی مۆلینا
## كوینكا/ ١٥٠٢

### (3)

ڕۆڵەكانم، ئەمڕۆ ئەوی پێشبینیمان كردبوو بە دی دێت. ئەمڕۆ پاشای كاسۆلیك پەیمانەكەی لەگەڵ ئەبوعەبدوڵلا سەغیر هەڵدەوەشێنێتەوە. ئەمڕۆ موسوڵمانان سەرپشك دەكات لە نێوان بەكرستیانبوون، یاخود ڕاگوێزانی یەكجاری. ئەوی پێش ساڵانێك لە كوینكا ڕووی دا ئێستا لەو مەملەكەتە ئیسلامییانەی داگیر كران ڕوو دەدات. دادگەكانی پشكنین، كە لە كوینكاوە دەرچوون دەگەنە سەرتاپای ئەندەلووس. ئەوی ڕابورد بە بەراورد بەوی دادێ، لێبوردەیی بوو. لە نێوان ئەو دوو شتە تاڵەشدا، كەسوكارمان لەوێ كەمتاڵەكە هەڵدەبژێرن: بەگاوربوون. ئاخر هەژاران كەسانی دیار و باڵا نین بۆ ئەوەی ڕابگوێزرێن، سەركردەی سوپاش نین، تاكوو دەرچەیەك بدۆزنەوە.

له ئەمڕۆوە، براكانتان لە؛ غەرناتە، قورتوبە، ئیشبیلیە، قادش،

جەیيان و ماڵقە... تاڵیی شکست دەبینن. ئیدی ناهێڵن بە ئارەزووی خۆیان ناوی منداڵەکانیان بنێن. حەز لە چی بکەن بخۆن. ئەو سترانە بچڕن حەزیان لێیە. لە ئەمڕۆوە دەبنە "کرستیانە تازەکان". لە ئەمڕۆوە، وەك ئێمە ئەگەر گۆشتی بەراز نەخۆن، دادگەکانی پشکنین ملیان بە قەنارەوە دەکەن. ڕەمەزانان بە نهێنی ڕۆژوو دەگرن. بە دزییەوە نوێژ دەکەن.

ڕۆڵەکانم، ئەوی پێشتر بۆ خەڵکی کۆنکە نووسرابوو بۆ ئەمانیش دەنووسرێت: بە ئاشکرا نوێژ بۆ مەسیح و بە دزییەوە نوێژ بۆ محەمەد.

ڕۆڵەکانم، دەست لە ملی یەکدی بکەن، ئیدی ئەو ڕۆژە هاتووە بۆ کوشتنتان نەبێت کەس دەست لە ملتان ناکات.

# 30

"ئێمەی قەشەکانی کڵێسای کوینکا، لە ڕۆژی یەکەمی ساڵی ١٤٧٩دا دوای پشکنین و لێکۆڵینەوە، پاش گوێگرتن لە گەواهیی گەواهیدەران، دانی پێدا دەنێین، ناوبراو خووسێ ئیرناندیس، موسوڵمانە و لە خانەوادەیەکی کاسۆلیکە، بە درۆ گوتوویەتی گەڕاوەتەوە سەر کاسۆلیکیزم، دوای دەرچوونی فەرمانی پاشایی بە دەرکردنی موسوڵمانان، یان گەڕانەوەیان بۆ ڕێگەی ڕاست، ئێمە بە شێوازە جۆراوجۆرەکانمان بۆمان دەرکەوتووە ڕەمەزانان وەك هەر موسوڵمانێکی دی ڕۆژوو دەگرێت.

لەسەر ئەو بنەمایە، ویژدانمان ئاسوودە بوو، بەڵام فەرمانی ڕاست بەسەریدا ئەوەیە، لەسەر تەختەکە ڕابکشێت، لە دواوە دەست و پێی ببەسترێن و ئەشکەنجەی دادپەروەرانە بدرێت، بە بڕینی ئەندامەکانی جەستەی لە یەکتر تاکوو مردن. چونکە لەوانەیە ئەشکەنجەدان پاقژکردنەوەی ڕۆحە خودانەناسەکەی بێت".

**(دادوەریی خووسێ ئیرناندیس، کوینکا، ١٤٧٩، لەبەر ڕۆژووگرتنی لە مانگی ڕەمەزاندا)**

# 31

## له کاغەزەکانی مانوێل کارلۆسی کوڕی مەروان کوڕی مەریەمی کیژی عەبدوڵلا دی مۆلینا (مانوێل دی مۆلینا)

کوینکا/ ١٦٠٩

### (1)

دایکم گوتی، دەبین بە بەرد. دوای نیو سەعاتی دی دەبین بە بەرد. گوتم بڕوا ناکەم. باوکم گوتی، کەواتە دەبێت ئامادە بین. دایکم گوتی، چۆن ئامادە بین؟ باوکم گوتی، بەوەی چیایەکی دوور دوور هەڵبژێرین. دایکم گوتی، دەکرێت لە هەر شوێنێك ببین بە بەرد. گوتم، نامەوێت ببمە بەرد. باوکم گوتی، بەردی سەر شەقامەکان وەك بەردی شاخ و کێو نییە. دایکم بێدەنگ بوو. گوتم نامەوێت ببم بە بەرد. باوکم گوتی، بەردی سەر جادە بۆ کوشتن، بۆ زامدارکردن، بۆ ئازار بەکار دەهێنرێت. بۆ ئەوە بەکار دەهێنرێت میزی بەسەردا بکەیت، یاخود بۆ خۆڕزگارکردن پێی. باوکم گوتی، بەردی سەر جادە منداڵان لە یاریکردندا بەکاری دەهێنن. باوکم گوتی، بەردی چیا پارێزراوە. باوکم گوتی، بەردی چیا جێگیرە. بەردی چیا حەساوەیە. دایکم گوتی، بەرد هەر بەردە لە گشت شوێنێك. من گوتم نامەوێت ببم بە بەرد. باوکم گوتی، نامەوێت لە هیچ

شوێنێك ببم بە بەرد. دەخوازم ببمە بەرد لە چیا. دایکم گوتی، دەتوانین جۆری بەردەکە هەڵبژێرین. من گوتم، نامەوێت ببم بە بەرد. باوکم گوتی، دەمەوێت ببمە بەردێکی مەڕمەڕ. دایکم گوتی، پێم باشترە بەردی گرانێت بم. من گوتم، نامەوێت ببم بە بەرد. دایکم گوتی، دەبێت هەڵبژێریت. دەبینە بەرد. گوتم، با ببمە بەردەلم. باوکم گوتی، ببە گرانێت. گوتم، نا. دایکم گوتی، گرانێت زۆر ئازار دەچێژێت. باوکم گوتی، گرانێت زۆر دەژی و بەرگە دەگرێت. دایکم گوتی، بەڵام زۆر ئازار دەچێژێت. دایکم گوتی، گرانێت وردوخاش نابێت. گرانێت پارچەپارچە دەبێت. من گوتم، نامەوێت ببم بە بەرد. باوکم گوتی مادام وایە ببە قسڵ. دایکم گوتی قسڵ چاکترە. وەك گرانێت ڕەق و وەکوو لمین نەرم نییە. باوکم گوتی، دەمەوێت ببمە مەڕمەڕ. گوتی، مەڕمەڕ ڕەقە. گوتی، حەزم لە ڕەقە. من گوتم حەز دەکەم ببمە لمین.

بەر لە تەواوبوونی نیو سەعاتەکە گواستمانەوە بۆ شاخ. شاخەکە لای ئەوسەری نزیك بوو لە ماڵەوەمان. شاخەکە بەسەر تەواوی کوینکادا دەیڕوانی. کێوەکە هێندەی گەورەیی جیهان مەزن بوو. شاخ یاخود گردۆلکە بوو. لێ چەشنی گەورەیی دنیا بوو. دەیڕوانییە سەر ئەو ماڵانەی لە تاشەبەردەکان هەڵکۆڵرابوون. خانووگەلێك بە شەرمەوە چەشنی پەنجەرە لە جیهانیان دەڕوانی. من لە لایەکەوە وەستام. دایکیشم لە لایەکەوە. باوکیشم لە لایەکی ترەوە. بێ حەزی خۆمان سێگۆشەیەکمان دروست کرد. هەر یەکەمان لەوی تری دەڕوانی، کەچی تەنیا سێبەر دەبینرا. دایکم زۆر بچووك بوو. باوکم زۆر بچووك بوو. دڵنیا نەبووم لەوەی دەیانبینم. وای بۆ دەچووم شوێنیان پێ دەزانم. لە

شوێنەکەیانم دەڕوانی و وێنای وێنەیانم دەکرد. جا نازانم وا دەهاتە بەرچاوم، یاخۆ بە ڕاستی دەمبینین. ئەگەر بینیبێتیانم ئەوا هێندەی گرێی پەنجەیەك بوون.

دایکم نەیگوت دوای قۆناغی بەردەکە چی دەبێت. گوتی، دەبینە بەرد. ئەمەی گوت و بێدەنگ بوو. وای گوت و باوکم لەسەر جۆری بەردەکە زۆری گوت. دایکم وای گوت و منیش لە وەرچەرخان ترسام. لە ڕاگوێزان. لە تەنیایی. ترسام لەوەی تەنیا ببمە بەردێك لە شاخ و هیچی تر. بەردێکی ڕووت لە خانوویەکدا. بەردێکی ڕووت لە گۆڕستانێکدا.

# 32

**له كاغەزەكانی مانوێل دی مۆلینا**

**كوینكا/ ١٦٠٩**

## (2)

له چیاكەدا له شوێنی خۆم وێستام. دوای ماوەیەك ڕەنگە چەند خولەكێك. ڕەنگە چەند سەعاتێك. دوور نییە چەند سەدەیەك. بووم بە بەرد. شێوەم چی لێ هات؟! نازانم! دەبێت من وەك بەردم لێ هاتبێت. بەردی سپیی زەردهەڵگەڕاو. دەبێت پێستم بە هۆی شێ، یاخود ئاوەوە داڕزابێت. بەڵام له ناوەوە وەك خۆم مامەوە. بەردەوام دەمبینی و دەمبیست و بیرم دەكردەوە. لێ بەردئاسا له قسەكردن وێستام. وەكوو بەرد له برسیەتی وێستام. بەڵام له تینوویەتی نەوەستام. زمانم هیشك هەڵات. گەرووم وشكوبرینگ بوو. ڕۆژێكیان هەستم بە نیگەرانی كرد. هەستم بە دەنگەدەنگ كرد. هەستم بە بوومەلەرزە كرد. یاخود هەورەبرووسكەیەك له ئاسمانەوە. لەودەمەدا بە وردئاگاییەوە بۆم دەركەوت و دەركم كرد. ئەو بارستەیەیان دەشكاند بەشێك بووم لێی. ئەو بارستاییەی ئینتیمام بۆی هەبوو. بەردێكیان له نزیكم هەڵكەند. بەردێكی گەورە پشتوپەنام بوو. بەردێك پڕ له

ژیان بە کوژراوی فڕێیان دایە بەردەمم. ئاخۆ بەردەکە ئامۆزاکەم بوو؟ دوو زەلامی کەتە ڕووبەڕووم وەستان. شەکەت بوون. وەستابوون هەریەکەیان تەماشای ئەوی دی دەکرد و جوێنی دەدا. جوێنەکان ئاراستەی بەردێکی لاڵ بوون. بەردەکەش ئازاری دەکێشا. گوێم لێ بوو بەردەکە ناڵەی دەهات. ئازاری دەکێشا و دژمانی بەو دوو زەلامە دەدا. لەو دەمەدا بۆم دەرکەوت تەنیا بەردەمی خۆم دەبینم. وام لێ هات توانای دیتنی ئەملا و ئەولای خۆم نەبوو. توانای ئاوڕدانەوەم لەدەست دا. پاشان گالیسکەیەك هات و بەردەکەی هەڵگرت. تەنیا ئەوی هەڵگرت. لە خێزانەکەیی دابڕی. خێزانێك بە خۆهەڵبڕینێکی کەم ماڵئاوایی لێ کرد. خێزانێك ئەم دەگەڕێتەوە سەری و من غەوارەم. بەسەر خێزانەکەوە غەوارەم. ڕۆڵەی خێزانەکە جێی هێشت و من مامەوە. وەکوو نامۆیەك وابووم. ئەوە لە سەرلەبەیانییەکی خۆرەتاودا ڕووی دا. دوای ئەوە هەتاوی قرچەی نیوەڕۆکە سووتاندمی.

ڕۆژەکانی داهاتوو کارەساتبار نەبوون. کارەساتبارتر نەبوون. هەڵکەندنی بەردێك دوو بەرد بووە شتێکی ئاسایی. سووتانی پێستی نەرممان بە خۆر بووە شتێکی ئاسایی. هەستکردن بە سەرما ئاسایی بوو. هەستکردن بە دابڕان. هەستکردن بە تەنیایی. لە ساتێکی تیژتێپەڕدا هەستم بە ترس کرد. ترس لەوەی بۆ شوێنێکم بەرن نەزانم کوێیە. بە ئامێرێکی تیژ هەڵمکەنن بەر جەستەم بکەوێت. لەوەی خراپ هەڵمبکەنن و قۆڵێکم ببڕنەوە. لە زەبرێکی هەڵەشانە بەر سەرم بکەوێت. هەستەکە ڕاگوزەر بوو. ڕاگوزەر لە ساتێکی سۆزداریدا. سۆزداری چونکە بەرد چارەنووسی حەتمییە. دەمگوت حەتمی و شتێکی ترم دەزانی.

دەمزانی بەردەیلێك هەن بۆ هەمیشە دەمێننەوە. دەمێننەوە بێ ئەوەی یەکێك ئاوڕیان لێ بداتەوە. لە ساتێکی ڕاگوزەری تردا ئاواتی ئەوەم خواست، لێرەدا بمێنمەوە بێ ئەوەی کەس بمبینێت.

# 33

**له کاغەزەکانی مانوێل دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٦٠٩**

## (3)

زەمەنێك تێپەڕی من هەر بەردم. زەمەنێك نازانم چەند. ڕەنگە سالآنێك بێت. لەوانەشە چەندان سەدە. گەلێك هەتاو بە بان جەستەمدا تێپەڕین. گەلێك مانگ لەسەر جەستەم هەلآتن. بارانەیلێکی فرە جەستەیان نوقوم کردم. بارانەیلێك گەیشتنە قوولترین شوێنم. ئەو شوێنانەم کە وا دەزانن زۆر گەورەن. هەلبەت باش دەزانم زۆر پووکن. ڕۆژێکیان ئەوە ڕووی دا، کە دەبوو ڕوو بدات.

ئامێرە ئاسنینەکە کەوتە گەڕ. منیش وەکوو منداڵ دەگریام. دەیکوتا بە لای ڕاست و چەپمدا. منیش چەشنی زارۆکان دەگریام. زایەڵەی لە مێشکمدا دەهات. بە مکوڕی لە قۆڵەکانم نزیك دەبووەوە. منیش وەك منداڵ دەگریام. پاشان زەبرێك بەر ئەژنۆم کەوت. بەری کەوت و هاوارم کرد. لەگەڵ هاوارکردنمدا کرێکارەکە ڕاپەڕی. بەردشکێنەکە ڕاپەڕی. ڕاپەڕی و لە هاوکارێکی بە تەنیشتییەوە کاری دەکرد، پرسی، داخۆ گوێی لە هیچ هاوارێك بوو؟ ئەویش گوتی: نا. گوێم لێ

نەبووە. گوتی، وا دیارە وڕێنەت کردووە. گوتی، بەرد هەست ناکات. ئەوە بوو کابرای قایەشکێن بە وزەیەکی کەمترەوە گەڕایەوە سەر ئیشەکەی. بە تۆخماخ کوتانی سووکتر. دوور نییە وای زانیبێت لە ئەژدیهایەکی نووستووی سەر بەردێکی داوە. پێ دەچێ وای زانیبێت ئەژدیهاکە هەمان بەردە. ڕەنگە وای بۆچووبێت وڕێنە بووە. سەدان کوتان بوونە ئەگەری قڵیشانم. دوولەتبوونی جەستەم. لەتلەتبوونی ڕۆحم. پاشان بەردشکێنەکە بە زەحمەت هەڵیکەندم. بە دەست و پێیەکانی پاڵی نام. لە هۆکاری ئازارە زۆرەکەم ئاگەدار بوومەوە. تەماشای جێگەکەمم کرد پەنجەکانی پێ و بەشێك لە پاژنەکانی خۆم بینین. گوتم ماڵئاوا پەنجەکانی پێم. گوتم ماڵئاوا پاژنەکانم. لەو کاتەدا دایکمم بیر هاتەوە. هەروەها باوکم. ڕەنگە مەڕمەڕخواز و گرانیتخواز بوومایا ئەوا بە بەرکەماڵیی دەمامەوە. دوور نییە لمخواز بوومایا هەپروون بە هەپروون دەبووم. هەپروون بە هەپروون ببوومایا و کارم تەواو ببوایا. بەڵام من بەردخواز بووم. بەردخوازێك ئەوەندەی لە ژیان هەیەتی لە فەوتانیش هەیەتی. بەردخوازێك ئازار دەکێشێت، لێ نامرێت.

لە گالیسکەکەوە تەماشای هاوەڵە بەردەکانم دەکرد. خێزانە بەردەکانم. چاودێریی کپییەکەیانم دەکرد. بێدەنگییەکەیان یاخود لاڵبوونەکەیان. نیگا بێئاگاکانیانم دەبینی. چاوەڕوانی ڕۆڵی تریانم لە ژیاندا دەبینی. لە ژیان یاخود مردندا. نەمدەزانی ئاخۆ هەموو بەردەکان هەر لە بەراییەوە بەرد بوون. دەڵێن لە سەرەتاوە بەرد هەبوو. یانەخۆ ئادەمیزاد بوون و گۆڕاون. گۆڕان و شێوەشیان لەگەڵدا گۆڕا.

کاتێك بە شوێنەکەی دایکمدا تێپەڕیم نەمبینی. لە نێوان

بەردەکانی تردا توابووەوە. بە تێپەڕینی کات ڕەنگی گرتبوو. بووبووە پارچەیەکی سیامی.[1] نەمدەتوانی دایکم بناسمەوە هەرچەندە جێگەکەیم ناسییەوە. ئەو خاکەی لێی بوو ناسیمەوە. باوکم بەختی لەو چاکتر نەبوو. وەکوو هەزاران بەردی ڕیزکراو بە شارەزایی لە بان یەکتر دانرابوو. وا دانرابوون کێوێکی جوان و پتەوتریان دروست کردبوو. کێوێك وەڵامی بە بوومەلەرزەکان دەدایەوە. باوکم لەوێ بوو. دیارە بێدەنگ بوو تەماشای جیهانی دەکرد.

لەوانەیە لە من گەڕابێت. یان لە دایکم. ڕەنگە ئەو یادەوەرییانە بیر خۆی بهێنێتەوە تێیاندا بەرد نەبوو. ئاخۆ ئێستا بە بیرۆکەکانیدا هەمبەر ژیان و مردن دەچێتەوە؟ سەبارەت بەدبەختی و بەختەوەری. دەربارەی خێزان و ڕەبەنی. دەربارەی ئایین و لێبوردەیی. ڕەنگە وا بکات. دوور نییە لەگەڵ ڕەوشە نوێیەکەیدا ڕابێت. ئەوی من بزانم باوکم پلە بە پلە گۆڕا. ئەو دەیگوت ئەندامەکانی ناوەوەی دەبوونە بەرد. بە هێوری هەستی بەم وەرچەرخانە دەکرد. جارێکیان بە دایکمی گوت ئاوی دەوێت. تەنیا ئاوی دەوێت. دەیگوت گەدەی بووەتە پارچە بەردێکی وشك. پارچە بەردێك تەنیا داوای ئاو دەکات. چەند ڕۆژێك بەسەر ئەوەدا تێپەڕین. چەندین ساڵ تێپەڕین. دواتر بێ یەقین بە دایکمی گوت دڵ و گورچیلە و سپڵ و ڕیخۆڵەی بوونە بەردی بچووك بچووك. جەستەیەك لە ئێسك و گۆشت تەنیا چوارچێوەی بەردە وردەکان بوو. دایکم خەنییەوە. دایکم گریا. دایکم تێ فکری. منیش چاوم لە باوکم بوو وەك یەکێك

---

[1] سیامی: دووانەی سیامی. بە دوو منداڵی پێکەوە نووساو دەگوترێت. لێرەدا مەبەست دوو بەردی پێکەوە نووساون. (وەرگێڕ)

له بانیژەوە تەماشای زەوییەك بكات شارەزای نەبێت. زەوییەك پێیان ڕاگەیاندم هی منە. هی من بێ ئەوەی قۆچانی خاوەنداریێتییم هەبێت.

ڕۆژان هاتن و چوون. سالانێك تێپەڕین. چەندین سەدە بەسەر چوون. دوای ئەوە ڕەنگە وەرچەرخانە یەكجارەكییەكەی دایكمی بەدوادا هاتبێت. بۆیە وا دەڵێم لەوانەیە نەزانم. ئەوی دەیزانم ئەوەیە دایكم بوون بە بەردمانی پێ ڕاگەیاندین. پێی گوتین و جێگەی خۆمانمان هەڵبژارد، چون بەوە سەرپشك بین.

## 34

ئاخر مۆریسکییەکان چ تاوانێکیان کردووە؟

# 35

## لە کاغەزەکانی مانوێل دی مۆلینا

## کوینکا/ تولەیتولە/ ١٦٠٩

### (4)

باران وا بە خوڕ دەباری نوقمی کردم. ئەو گالیسکە بچووکەی هەڵیگرتبووم ئاو هەڵیگرت. نوقمی کردم و تینوویەتییەکەمی شکاند. لە توێی درزەکانمەوە دزەی کرد و ئازارەکەی شکاندم. درزەکانم کەم بوون. کەم و تەنگ بوون. حەزم بە زێدەگۆیی نییە. درزەکان قورس نەبوون، بەڵام چەشنی دەرزیپیاکردنێك کەس نایبینێت کەچی تۆ هەستی پێ دەکەیت. بۆیە هەستی پێ دەکەیت چونکە چەقینە لە گیانی خۆت. دەنگی کرێکارەکان بڵند بوو. دەمێك ستایشی یەکدییان دەکرد و دەمێکیش دژمانیان بە یەکدی دەدا. لە کاتێکدا گالیسکەوانەکە بێدەنگ بوو. کرێکارەکەی نزیکم قسانی بۆ دەکردم. قسانی بۆ دەکردم و تەماشای دەکردم وەك ئەوەی بمبینێت. چون ئاشکرام بکات. سکاڵای لەدەست هیچ نەدەکرد. بە شێوەیەك دەدوا وەك ئەوەی قسان بۆ خۆی بکات. بە ژیانی خۆیدا دەچووەوە و بیری لە چارەنووسێکی جیاواز دەکردەوە. "چی دەبێت ئەگەر" بەکار

دەهێنێت. گوتی خۆزگەم بە بەختی تۆ ئەی بەرد. گوتی تۆ چەند بەختەوەری ئەی بەرد.

لەو نێوەدا گالیسکەکە بە گردێکی بڵنددا سەر دەکەوت. گردێك لە گرانێت. خانووەکانی سەر گردەکە دەیانڕوانییە سەر ڕووباری تاگۆ. من لە شوێنەکەی خۆمەوە لە ناو گالیسکەکە کۆشکەیلێکی بنیاتنراوم دەبینی. قەڵاگەلێك قوللەی بڵندیان هەبوو. شوورەگەلێك دەوری شارەکەیان دابوو. گەیشتبوومە توڵەیتوڵە. نیشانەکانی "دەرگەی درەخت"، پردی کەوانەیی، مزگەوتی مەردوم بوون. نیشانەی بۆنێکی عەرەبی بوو بۆنی زەویی خۆش دەکرد. لە مەیدانی "بازاڕی ئاژەڵان"دا گالیسکەکە وێستا. "کەوانی خوێن"م لە بەردەممدا بینی. یادگەم ئەو باپیرانەی بیر خستمەوە لەم کەوانە ملیان خرانە بەر سەرپەڕێنەوە. "شەوەکەی توڵەیتوڵە"م بیر هاتەوە، کە تێیدا قەسابخانە بۆ موسوڵمانان ئامادە کرا. بێ ئەوەی یەکێك لە کرێکارەکان ئاگای لێ بێت ڕۆندك بە چاوانمدا هاتە خوارێ. بە شێوەیەك ڕۆندك بە چاوانمدا دەڕژا نەمدەتوانی بەری بگرم. چاوم فرمێسکی پێدا هاتە خوارێ و تێکەڵ بە ئاوی بارانەکە بوو. لە ساتێکی تیژتێپەڕدا یەکێك لە کرێکارەکان چاوی لێ بوو. گوتی، بەرد دەگری. ئەوی دی گوتی، بەرد ئارەقە دەکات. یادگە بچووکەکەم داپیرانمی بیر هێنامەوە پرسیاری ئایینی خۆیان دەکرد و قژیان ڕادەکێشت و خۆیان بە گۆی مەمکەکانیانەوە هەڵدەواسی. ڕووت بوون، هەستیان بە شەرمی ڕووتبوونەوە دەکرد پتر لەوەی هەست بە ئازاری ئەشکەنجەدان بکەن. دایکمم بیر هاتەوە دەڵێت، ئەمە فەرمانی پاشایە نەك فەرمانی قەشە. پاشا ئیمپراتۆریای دەوێت نەك پشتیوانیی مەسیح. قەشە

دەسەڵات دەخوازێت نەك پشتیوانیی مەسیح. دایكم گوتی، هیچ دژایەتییەك لە نێوان مەسیح و محەمەددا نییە. دایكم گوتی، بەڵام دایكم بوو بە بەرد. دایكم گوتی، وەك ئەوەی بە قسەكەی نیگای ڕوخساری میدۆزای نەفرەتیی كردبێت.

كابرایەكی قژدرێژ نزیك بووەوە و تەماشای لای منی كرد. بە سەری ئاماژەی ڕازیبوونی كرد، لە مەبەستی نەگەیشتم. پاشان گالیسكەكە كەوتە ڕێ. هەردوو ئەسپ بە شەقامە بەرز و نزمەكاندا بە نەرمی ڕێیان دەكرد. ئەو شەقامانەی دەتگوت درزی پەنجەن. لەو كاتەدا من لەرز دایگرتبووم. نەك لە ترسی ئەوی دێت. بەڵكوو لە ترسی ئەوی ڕابورد. لە دواییدا گەیشتینە ماڵێك لە دەوروبەری توڵەیتوڵە. ماڵێك دەیڕوانییە سەر كڵێسای سان خوان دی لۆس ڕییس. تێبینیی ئەو كۆتوپێوەندە مسینانەم كرد بە ڕووی كڵێساكەوە هەڵواسرابوون. گوێم لە كرێكارێك بوو دەیگوت، ئەوانە كۆتوپێوەندی دوا دیلی كرستیانە بە دەست موسوڵمانەكانەوە. گوێم لە كرێكارەكەی تریش بوو دەیگوت، ئەوانە كلیلی ماڵە موسوڵمان و جوولەكە دەركراوەكانن لە وەختی كەوتنی غەرناتەوە.

من لە كۆتوپێوەندەكان ڕامابووم و دەمپرسی ئاخۆ هەر بە ڕاستی كۆتوپێوەندن. یاخود مرۆڤ بوونە و وەك ئێمەیان لێ هاتووە. گوێ دەگرم و بیر لەوە دەكەمەوە كرێكارەكە گوتی "كەوتنی غەرناتە" نەك "سەندنەوەی غەرناتە". بیر لەوە دەكەمەوە ئەم كرێكارە سەر بە خانەوادەكەمە.

لە ماڵەكەی توڵەیتوڵە لە هەیوانێكی بێ میچ جێیان هێشتم. هەیوانێك لە میانەیەوە چاو لە ئاسمانی هەورین ببڕم و پەنجەرە و بانیژەكان بەسەرمدا بڕوانن. ئەوان بەسەرمدا دەڕوانن و من

لەسەر پشت ڕاکشاوم. بۆ ڕۆژی دوایی زەلامەکە دەرکەوت. زەلامە قژدرێژەکە. لەودەمەدا تێبینیی ئەوەم کرد ڕدێنیشی درێژە. لەوە لاوازتر بوو دەردەکەوت. چاوەکانی زیاد لە پێویست بە قووڵدا چووبوون. بەڵام بایەخی پێ دام. گرینگیی بە پاراستنم دا. تێبینیی قڵیشە وردەکانی جەستەی کردم. تێبینیی زیانەکانی پێ و پاژنەی کردم. ئەوە تووڕەی کرد. لەگەڵ تووڕەییەکەیدا بێدەنگ بوو. پاشان بڕیاری دا ژیانم پێ ببەخشێت. ئەو ژیانەی وای دەبینێ شایانیم. ئەو ژیانەی جیاوازە لەوی بۆی چووم. ئەو ژیانەی ژیانم دەپارێزێت. ڕەنگە وای گوتبێت. یان لەوەیە من وا تێگەیشتبم. لەوە دەچێت شتێکی تری گوتبێت و من وا تێگەیشتبم. یان لەوانەیە ئاواتی ئەوەم دەخواست. ئیدی بە ئامرازە سەختەکانی دەستی بە کار کرد و یەکەمین جار دوو پێی دروست کرد. ئەوی نێوانیانی شکاند و شتە زیادەکانی لابردن و ئەوجا لاقەکان دەرکەوتن. بە هێوری کاری دەکرد. بە ئارامی لاقەکان وەرسووڕان. پاشان وازی لە پێیە کۆنە ناقۆڵاکان هێنا. هەر بە هێوری دوو پێی تری چێ کرد. دوو پێی گەورەتر. جووتێك پێ دوو سۆڵی ئەستووریان لەپێ کردبوو. لە من نەدەهاتن. لەبەر لاوازیم لە منێکی کورپێژگەی کەم جورم نەدەهاتن.

کابرای لەڕولاواز بەردەوام کاری لە جەستەم دەکرد. جەستەشم لە هەیوانی ماڵەوە نوستبوو. زۆری کار کرد. شەو و ڕۆژ. لە تەکم نانی خوارد. هەر بە تەنیشتمەوە خواردییەوە و نووست. لە پەنجەرەکەیەوە چاوی تێ بڕیبووم. لە بانیژەکەیەوە تەماشای دەکردم. شتە زیادەکانمی بە پارچە پەڕۆیەك دەسڕینەوە. دانیشت و قسانی لەگەڵدا کردم. باسی ئەوەی دەکرد

لێی دەویستم. ئاواتی بەردەوامی و هەتاهەتایی بۆ دەخواستم. گوتی من کوڕی ئەوم. ئەو کوڕەی نەیبوو. باسی ئەو منداڵانەی خۆی بۆ کردم ئێستا لە مەیدانەکان بڵاو بوونەتەوە. باسی ئەو مێژووەی منی کرد، کە دەیزانی. دەیزانی و نەیدەزانی. لە چیرۆکەکانییەوە ئایندەی خۆمم زانی. لە چیرۆکەکانییەوە کونجکۆڵییەکەمی ورووژاند. دەمویست پرسیاری دایکمی لێ بکەم. دەمویست پرسیاری باوکمی لێ بکەم. دەمویست لێی بپرسم: ئاخۆ ژیان بە جۆرەکانی تری بەرد دەبەخشرێت؟! من پرسیارم نەکرد و ئەویش گوێی نەگرت. ڕەنگە پرسیارم کردبێت و گوێی لێ نەبووبێت. دووریش نییە بیستبێتی. گوێی لێ بووە بێ ئەوەی وەڵام بداتەوە. لەوانەشە وەڵامی دابێتەوە و من نەمبیستبێت. ئەو وەڵامی دایەوە، بەڵام من بیرم لە دایکم دەکردەوە. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ دایکم کردمانی بە بەرد. پێ دەچێ وەکوو دوا تەوقی قوتارکردن بە بەردی کردبین. وەکوو بەرد بژیت باشترە لەوەی وەکوو مرۆڤ بمریت.

# 36

## کاغەزەکانی مانوێل دی مۆلینا

## تولەیتولە/ ١٦٠٩

### (5)

یارۆی پەیکەرساز پەرجووی نواند، بۆیە پەرجووی نواند تاکوو قۆڵ، یاخود قامکی یەکێك نەشکێنێت. بە ئامرازەکانییەوە بە هێورییەکی بەرچاوەوە جووڵا. بە شێوەیەك ڕێی دەکرد چون جەستەی ڕاستەقینەم ببینێت. هەموو پارچە زیادەکانی لەسەرخۆ لابردن. بە لەسەرخۆییەك شایانی پەیکەرتاشێکی دڵباش بێت. وەك چۆن شایان بە دایکێکە نینۆکی کۆرپەکانی دەکات. بەڵام قەڵەوتری کردم. جەستەیەکی گەنجتری دروست کرد. بەرگەی هەموو ئەمانەم بە لێبوردەییەوە گرت. بە ئارامییەوە بەرگەم گرت. بیرم لەوە کردەوە ڕەنگە پێویست بێت ببمە پیاو. بیرم لەوە کردەوە پێویستە ببمە پیاو. ناکرێت لە قۆناغی کوڕیژگەییدا بوەستم. پێویستە گەورە ببم. گەشە بکەم. کەمێك بەهێزبم.

پاشان جلێکی سەربازیی لەبەرکردم. دواتر ڕوخسارێکی جیاوازی لە ڕوخساری من تاشی. وردە بەردەکانی ناو چاوم و

کونەتفنکانمی لابرد. لۆچەکانی گوێ و ڕوخسارمی کێشا. ڕوخساری پیاوێکی چل پەنجاساڵی بوو. پاشان زرێیەکی درێژی بۆ جەستەم درێژ کرد و کڵاوئاسنێکی نایە سەرم. ئەوجا بە هەر حاڵێك بوو لە کۆتاییدا ئاهێکم هەڵکێشا. هەستم کرد دنیا دەبینم. هەستم کرد دنیا دەمبینێت.

دوای کێشـــانم لە شـــوێنی خۆمـــدا مـــامەوە. ڕۆژانە پەیکەرتاشـەکە دەهـات و دەسـتکاریی بچـووکی دەکـردم. بـۆ لابردنی پاشماوەی تۆز. بۆ لووسکردنی بەشـێك لە بەشـەکان. لە هەموو ئەمانەدا من لەسەر پشت نووستبووم. هەموو ئەمـانە و مـن تەماشای ئاسمانم دەکرد، تاکوو چارەنووسـمی تێـدا بخـوێنمەوە. ئەو چارەنووسەی هەرگیز دیار نەبوو. ئەو چارەنووسـەی جـاری یەکەم دەسـتی پێـدا هێنـام دەرمخسـت. لەودەمەدا دەمویسـت ڕوخسارم لە ئاوێنەدا ببینم. تاکوو بزانم چیم لێ هاتووە. لە خۆم دەپرســی ئـاخۆ لە بـاوکم دەچـم. دەمپرســی ئـاخۆ ڕوخســارە تازەکەم لە ڕوخسارە کۆنەکەم دەچێت؟ دەمپرسی و نەمدەزانی. چــۆن بــزانم لە کاتێکــدا تەنــانەت دەســتم بەر دەموچــاوم نەکەوتووە؟!

چەندین ڕۆژ بە حەپەساوی مامەوە. ڕەنگە چەند مانگێك، یان ساڵانێك بووبێت. هەتاوەکان هەڵاتن و ئاوا بوون. مانگەکان دەرکەوتن و ون بوون. ڕۆژێکیان کابرای لەڕولاواز نزیك بووەوە. لێم نزیك بووەوە و بزەیەکی بۆ کردم. گوتی تۆ ئەمڕۆ بەرکەماڵ بوویت و لە هیچت کەم نەبوو. تەنیا لەوەت کەمە لە مەیدان بوەستیت. پاشان لە کاغەزی پێچام. بەرێ ڕووناکیی لێ گرتم. بەری گرت و لێی دا ڕۆیشت. بە کوێریی ژیام. کوێریش تەنیا خەیاڵ دەبینێت. نابینا تەنیا ڕابردووی خۆی

دەبینێت. بەڵام من لاڵ نەبووم. هەموو دەنگەکانی دەوروبەرم دەبیست. هەستم ڕاگرتووە بۆ هەر کەسێك ناوم بەرێت. ئێوارانیش پاسەوانێك دێت بۆ لام. بە تەنیشتمەوە دەخوا و دەخواتەوە. بە دەنگی نزم حەکایەتم بۆ دەگێڕێتەوە، وەك ئەوەی بۆ خۆی بگێڕێتەوە. جارێکیان گێڕایەوە باپیرانی بۆ ئێرە هاتوون، چونکە ڕۆدریك پاشا، شای قووتییانی ڕۆژئاوا، لاقەی کیژێکی کردبوو. کیژەکە کچی فەرمانڕەوای سەبتە بوو، ناوی دۆن یولیان بوو. یولیان لە پشووی حەسانەوەدا بوو لە تولەیتولە. کچەکەی لە "گەرماوی کابا" کولی دەکرد، ڕۆدریك بینی و شێت و شەیدای بوو. ئیدی یولیان بڕیاری دا تۆڵەی لێ بستێنێتەوە. ئەوە بوو داوای لە موسوڵمانان کرد بچنە نیمچەدوورگەی ئایبیریاوە و لە شەڕی دۆلی لەکە یارمەتیی سەرکەوتنی دان. پاسەوانەکە دەبێژێت هاتنە ناوەوەی باپیرانی نەخشەبۆکێشراو نەبوو. ئاواتیان باشووری دەریا و مانەوە لە باکووری نەدەبڕی. بەڵام بانگەوازەکە تەماحی دانێ و هەستیان بە کاریگەرییەکەی کرد. پاسەوانەکە دەبێژێت، ئێستا نەوەکان بۆ وڵاتێکی تر کۆچ دەکەن. بۆ سەرزەمینێکی دی. دەڵێت ئەو نازانێت ئاخۆ خزمەتەکانی بۆ کڵێسا و پاشا دووری دەخەنەوە لە چارەنووسی کەسوکارەکەی تری یاخۆ نا. منیش لەودیو نابیناییەکەمەوە لێی دەڕوانم. وا بزانم دەیناسم. وا بزانم هەستم پێ دەکات. ڕەنگە ڕۆژێك بێتە بەرد.

بۆچی یارۆی پەیکەرساز دوای ئەوەی ژیانی بە بەردا کردم، ون بوو؟ ئەی بۆ یارۆی پاسەوان باسی چارەنووسی خۆمم بۆ ناکات؟ چما بۆچی یارۆی پەیکەرساز وازی لە

دروستکراوەکەی هێنا؟ ئەی بۆ یارۆی پاسەوان مێژووی خۆمم بۆ دەگێڕێتەوە؟!

ڕۆژ و مانگ و ساڵان بە قورسی تێپەڕین و منیش لەژێر داپۆشەکەمەوە هەر دەگریم. پاشان چەند زەلامێك هاتن و هەڵیانگرتم. خستمیانە گالیسکەیەکەوە و بردمیان. دەڕۆیشت و منیش لەژێر داپۆشەکەمەوە چاوەڕوانی شوێنێکی نوێ بووم دامبنێن.

## 37

**کاغەزەکانی مانوێل دی مۆلینا**

**تولەیتولە/ ١٦٠٩**

**(6)**

گالیسکەکە لە گۆڕەپانی "مەیدانی ئاژەڵفرۆشان" وێستا. گۆڕەپانێك بۆ پەزکڕین هاموشۆیمان دەکرد. دەڕۆیشتین تاکوو لەوێ چاومان بە کەسوکارمان بکەوێت. گۆڕەپانەکە لە شێوەی کلیلی ژیانە. بازنەکەی لە بەرابەر "کەوانی خوێن"ە. پشتیشی ڕێگەیەکە دەتباتەوە سەر پردی کەوانەیی و ڕووباری تاگۆ. ددانەکانی کلیلی گۆڕەپانەکە ڕێگەیەکە بە ئاقاری "دەرگەی درەخت" و دەروازەی ئەلڤۆنزۆی شەشەمت دەبات. گۆڕەپانێکی جەنجاڵ و قەرەباڵغی پڕ لە ژاوەژاو. ژاوەژاوێك لە ناویدا گۆڕەپانێکیان چێ کرد. منیان لە نێوان بازنە و ددانەکانیدا ڕاگرت. ڕایانگرتم و دایانگرتم. دایانگرتم و ڕووتیان کردمەوە. کاغەزەکانیان لە جەستەم کردەوە. کاغەزەکانیان لێ داماڵیم و بە پەڕۆیەك تەکاندمیان. لەپڕ ئاگەدار بوومەوە و بزەیەکم هاتێ. تێبینیی ئامادەبوونی پەیکەرسازەکەم کرد لە بەردەممدا و زەردەخەنەیەکم کرد. تەماشای کردم و گرژییەوە. بە

کرێکارەکانی گوت: بڕوانن. بڕوانن پەیکەرەکە دەخەنێتەوە. کرێکارەکان تەماشایان کرد و گرژینەوە، گوتیان کۆتەڵەکە پێدەکەنێت. من بزەم دەهاتێ و کەیفخۆش بووم. دەتگوت گەڕاومەتەوە نیشتمانەکەم. وەك ئەوەی گەڕابێتمەوە منداڵدانی دایکم. ئەو دایکەی نەمزانی چی لێ هات! ئەو دایکەی نەمدەزانی ئاخۆ جارێکی دی دەیبینمەوە. پەیکەرتاشەکە بە کرێکارەکانی گوت: بڕوانن، بڕوانن پەیکەرەکە مۆن و ڕووترشە. گوتی پەیکەرەکە بخەنە سەر بناغەکە. گوتی، باش ئاگەدار بن، نەکوو زامدار بێت. ئەو وای گوت و من بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ بەرد دوای ئەوەی دەبێتە پەیکەر، زیانی چی دەکات ئەگەر بریندار بێت؟ وای پێ گوتن و لە تەکیاندا بوو. لە هەر هەنگاوێکدا بە تەنیشتیانەوە بوو. جەستەم لەوێ چەسپی. لەسەر بناغەیەکی گرانیتی. ڕەق ڕاوەستابووم بە قامکی دۆشاومژەم بە پشتی بەهێز و نیگایەکی لەخۆڕازی و سینگی پڕ لە هێز و هەستی پڕ لەخۆباییەوە ئاماژەم بۆ پێش دەکرد. بە کلیلی ژیان دەوری دابووم و منیش چەقەکەی بووم. بەڵام بە هەستێك لە خاڵی بوون. بەتاڵییەك هیچ شتێك پڕی نەدەکردەوە. بەو هەستەی ڕوخسارێك هەڵدەگرم ڕوخساری خۆم نییە. پۆشاکێك لەبەردەکەم پۆشاکی من نییە. بەوەی ڕوواڵەتێکی ترم خواستووە. یەکێکی دی نەك من. منیش خۆم لە ناخمدا نەدەبینییەوە. دەرەوەشم تابلۆیەکە چەشنی کێلی قەبر. کێلێك ناو و مێژووی لەدایکبوون و مەرگی هەڵگرتووە. ناوێك ناوی من نییە. دیرۆکێك سەر بە من نییە.

# 38

**کاغەزەکانی مانوێل دی مۆلینا**

**تولەیتولە/ ١٦٠٩**

**(7)**

لە ڕۆژانی یەکەممدا وەکوو کۆتەڵێك هەستم بە سەرسوڕمان دەکرد. هاموشۆکەران لای بناغەکەم دادەنیشتن. وشەی خێرایان دەگۆڕییەوە و بە بێدەنگیی پشوویان دەدا. هەندێك لە ڕێبواران لە بەردەممدا دەوەستان. پاشان هێندەی نەدەبرد زارۆکان بە قەدمدا هەڵدەگژان. هەرزەکارانیش ناوی خۆیان لەسەر جەستەم دەنووسی. ناوی خۆیان بە تیر و دڵەوە. لێ کارەکە هەر بەوەندەوە نەوەستا. بە تێپەڕینی کات وای لێ هات هاموشۆکەران میزیان بە بنکەکەمدا دەکرد. کوڕانیش بە بەردی بچووکەوە نیشانیان لە چاوم دەگرت.

ئێستا من زیاتر پەڕگیرم. پتر گەرمیی هەتاو و سەرمای زستان لێم دەدەن. ئێستا من هەتیو کەوتووم. لەو دەمەوە بێکەسم

پەیکەرتاشەکە لێم ون بوو. ئاخۆ بەردی باڵەخانەکان هەست بە هەمان هەستی من دەکەن، یاخود پێکەوەلکانی هەر بەردێك لەگەڵ ئەوی دیدا بەسە بۆ دوورکەوتنەوە لە ئازار. با بە ویژدانەوە قسە بکەم: هەموو شتێك لە هەمان کاتدا بەسەرمدا دەهاتن: یاری و میزکردن و بەردباران و دانیشتنی ڕێبواران و ڕابواردن. هەروەها بۆ ئەوەی زیاتر بە ویژدان بم دەڵێم، من ناتەواو بووم. بۆ پەیکەر دروستکردن یارۆی پەیکەرتاش وازی لە هەندێك بەشی من هێنابوو. هەندێك پارچەیشی بۆ زیاد کردم هی من نەبوون. چەند جار بێ دەست دەژین و وا دەزانین دەستمان لە شوێنی خۆیدایە.

ڕۆژێکیان ئەوە ڕووی دا تێپنەگەیشتم. قەرەباڵغییەکم بینی هاتنە گۆڕەپانەکەوە و کەوتنە هوتافکێشان. پێشتر بە هیچ شێوەیەك قەرەباڵغیی وام نەدیتبوو. کۆمەڵێك بەرەو بازنەی کلیلی ژیان ملیان دەنا. ڕێیان دەکرد و لەپڕ وێستان. وێستان و لە من نزیك بوونەوە. کاتێك نزیك بوونەوە ناسیمن. کەسوکارەکەم بوون. هەندێك لە خزمانم. ئاپۆراکە لێم نزیك بوونەوە و بەردبارانیان کردم. تفبارانیان کردم. بە دار و ئاسن لێیان دام. لێیان دام و دەستم بە گریان کرد. لەبەر ئازار نەگریام. لەبەر توندوتیژی نەگریام. لەبەر ئەوە گریام نەمدەتوانی بڵێم من کێم. توانای ئەوەم نەبوو بڵێم من ئەوە نیم ئێوە بۆی دەچن. بێژم ڕوواڵەتێکم هەڵگرتووە هی من نییە. ناوێك ناوی من نییە. مێژوویەك مێژووی من نییە. لەپڕ لەسەر بناغەکەم ڕایانکێشام. کەوتمە سەر زەوی و بە پێلەقان نەفرەتبارانیان کردم. گوتیان ئەڵاهوئەکبەر. ئیدی بوومە سەت بەرد. سەت پارچە. بە تەنیشتمەوە قۆڵەکانی خۆمم بینی. لاقم لە گۆشەیەکی دوور بوو.

پێم گوتن ئێوە لە جەنگێکی هەڵەدان. قسەم دەکرد و گوێیان نەدەگرت. گوتم و بەخشیمن. ترسنۆك دەکوژێت و ئازاش بە لێدان وەکوو سزا واز دەهێنێت. توندوتیژی ڕۆڵەی شەرعیی هەڵچوونە. شکستخواردووان تەنیا تۆقاندن دەزانن. لەو نێوەدا زانیم بوومە بە کێ! دەرکم کرد چۆن یارۆی پەیکەرتاش کردوومی بە فەرماندەیەکی جەنگ، تاوانکارێك خوێن دەڕێژێت. منیش، من کێم، تەنیا بەردێکی بێگوناه!

چەند ڕۆژێکی دی بەسەر چوون. ڕۆژانێك کەسانی ناو حەشاماتەکە وەکوو قەڵغانی خۆپاراستن بەکاریان دەهێنام. وەکوو تیری بەهێز. لاقیان بۆ پتر لە پارچەیەك شکاندم. بە پارچەکانم لەوانەیان دا هێرشیان دەکردنە سەر. پاشان جەستەم شەلاڵی خوێن بوو. یەك پارچە گیانم بە خوێنەوە بوو، بەڵام خوێنی خۆم نەبوو. دواتر چون هیچ نەبووبێت هەموو شت تەواو بوو. ئەوجا شتێکی لە ناکاو قەوما.

لە شوێن خۆمەوە چاوم بە گالیسکەیەك کەوت دەمناسییەوە. گالیسکەکە لای ددانەکانی کلیلی ژیان وێستا. پەیکەرتاشە لاوازەکەی لێ دابەزی. ژمارەیەك کرێکاریش دابەزین. کرێکارەکان پەیکەرێکیان داگرت. پەیکەرەکە لە کاغەز پێچرابوو. کرێکارەکان پەیکەرەکەیان ڕووت کردەوە. پەیکەرەکە من بووم. مەبەست ئەوەی من ڕۆڵیم دەگێڕا. پەیکەرەکە تەماشای کردم و گریا. منیش تەماشایەکیم کرد و ئەسرین بە چاوانمدا هاتە خوارێ. کابرای لەڕولاواز بە کرێکارەکانی گوت، تەماشا بکەن. گوتی ئەوە کۆتەڵەکە دەگری. لە کاتێکدا من و باوکم بیرمان دەهاتەوە و نیگای پەنهانمان دەگۆڕییەوە.

## 39

## کاغەزەکانی ئایشێی کچی مەریەمی عەبدوڵلا دی مۆلینا

## (ئایشە دی مۆلینا)

## کوینکا/ ١٥٢٨

### (1)

بۆ سەرلەبەیانی، قۆڵم بەردەبێتەوە. نیوەڕۆ، قۆڵێکی دارین دێنم. بۆ ئێواریێش، لەسەر قۆڵە دارینەکە ڕاهاتم. سبەینێش، هەست دەکەم ئەو قۆڵەی ئێستا لێم بەردەبێتەوە، قۆڵی سروشتییە.

سەرلەبەیانی، هەموو بەیانیانێك، بە دوو قۆڵەوە بێدار دەبمەوە. وەکوو خەڵکی، هەموو خەڵکی، بە دوو قۆڵ بێدار دەبمەوە. بە دوو قۆڵەوە لە پەنجەرەکەی دەڕوانێتە سەر شەقامێکی جەنجاڵ سەر دەردێنم، بە دەستی چەپم ئاماژە بۆ ڕێبواران دەکەم. بە دەستی چەپم ئاماژە دەکەم، تاکوو بزانن قۆڵم هەیە و دەجووڵێت.

گشت ئەمانە لە کاتێکی زوودا ڕوو دەدەن. خەریکە خۆری سپێدە تاریکیی شەوەکە شەق دەکات. کەچی ئینجاش هەر قەرەباڵغە. ئینجاش لە پەنجەرەکەوە سەر دەردێنم. لە پەنجەرەیەکی گەورەوە سەر دەردێنم و بە دەستم ئاماژە دەکەم.

ئاماژە بۆ هاموشۆکەران، هەموو هاموشۆکەران و هیچ کەس دەکەم. سڵاوە نەبینراوەکەم باڵ دەگرێ و لەسەر هیچ کەس دەنیشێتەوە. هاموشۆکەران، گشت هاموشۆکەران تەماشای لای من ناکەن. بە هەنگاوی خێراوە بەرەو ئامانجێك شاراوە بۆ من و روون بۆ ئەوان، ڕێ دەکەن. کەچی من، تەنیا خۆم، چاوم تێ بڕیون. من خۆم، تەنیا خۆم، دەزانم لێرەم. کەچی من، تەنیا من، قۆڵێکم بەردەبێتەوە.

بۆ سەرلەبەیانی، لە بەردەم ئاوێنەکە ڕادەوەستم. بۆ نیوەڕۆیش، لە ڕووبارێکی بچووکدا لە ڕوخسارم دەڕوانم. ئێواریش، تەماشای خۆم دەکەم و خۆم نابینم. بۆ سەرلەبەیانی، سەرلەنوێ ئاهێکم پێدا دێتەوە، پێمدا دێتەوە، یاخود وا هەست دەکەم.

بۆ سەرلەبەیانی، هەموو بەیانیانێك، زیپکەکانم دەتەقێنم. بە دوو پەنجەی دۆشاومژە و پەنجەکەڵە، زیپکەکانی دەموچاوم دەگوشم. ڕوخسارە خڕەکەم بەو دڵڕەقییەم هاوار دەکات. زیپکەکانی دەموچاوم، بە بچووك و گەورەیانەوە، بە ئازار تۆڵەی خۆیانم لێ دەکەنەوە. ئەو زیپکانەی لە شەو و ڕۆژێکدا ڕوخساریان داگرتم، بوونە بارێك بە دەموچاومەوە.

لەو نێوەدا، گشت ئەمانە، ئاگەداری درزەکانی پەنجەرەکە بووم. لەو نێوەدا، ئاگەداری ژووانەکەم بووم کاتیەتی. لە ماڵ دەردەچم، ماڵە بچووکەکەم، بە ئاقاری شەقامە خۆڵینەکە. لە ماڵ دەردەچم، ماڵە خنجیلانەکەم، بێ ئەوەی بزانم بۆ کوێ؟! ئەمڕۆ، وەك هەر ڕۆژێکی تر، لە ماڵەوە دەردەچم بێ ئەوەی ئاقاری خۆم بزانم. ڕێدەکەم، بە تەنیا بە دوو قۆڵی هاوتەریبەوە ڕێدەکەم. ڕێ دەکەم، بە تەنیا ڕێ دەکەم، وێڕای ئەوەی شەقام

جەنجاڵە. هاموشۆکەران و سەرنشینان ئاگەدارم نین، لەپڕ، سەرەڕای ئەوەی ڕووداوێکی دووبارەیە، قۆڵێکم بەردەبێتەوە.

بۆ نیوەڕۆ، لە قرچەی نیوەڕۆدا، قۆڵە دارینەیەك دەبەستم. ڕێبواران و دانیشتووان بە قۆڵی داری دانانێن. دایناێن، من دەزانم دایناێن، چونکە تێبینیی ناکەن. ئینجاش بەتەنگەوەم هەمبێت. ئەگەر پێویستی کرد بۆ یەکێکی درێژ دەکەم. وەکوو نەریتێکی هەمیشەیی دەستی بەسەردا دێنم، تاکوو ئاسوودە بێت. لەوی دی پتر دەیجوولێنم، تاکوو بڕوای بە خۆی بێت. بە تەنیا بەرەو ڕووگەیەکی نەزانراو ڕێ دەکەم. بە خۆکاریی منداڵانە بە گردێکی بەرزدا سەر دەکەوم. بە خۆکاریی منداڵانە لە کەناری ڕووبارێکی بچووکدا دادەنیشم. بە چاوی پڕ لە سەرسوڕمانەوە لە ڕووی ئاوەکەوە لە دەموچاوم دەڕوانم. تەماشای ئەوانە دەکەم دوور دەکەونەوە. ئەوانی پێچەوانەی من ڕێ دەکەن، بۆ ڕووگەیەك خۆیان شارەزاین. هەندێکیان لەگەڵ خۆیاندا سەگ دەبەن، هەندێکیان پشیلە. هەندێکیان ئاژەڵ بە خێزانەکەی دەگۆڕێتەوە. بەڵام هەندێك جار، بۆ ئەوەی بەویژدان بم، باپیرە لەگەڵ نەوەکەیدا دەبینم.

بۆ ئێوارێ، هەموو ئێوارانێك، قۆڵەکە هاودەردیم دەکات. بە تێپەڕبوونی کات، درێژ بێت یاخود کورت، لەسەری ڕادێم. بە تێپەڕبوونی کات، وا بزانم کورت، دەستەمۆ دەبێت. قسە دەکەم، لێی دەڕوانم، بزە دەیگرێت. منیش زەردەخەنە دەمگرێت، تەماشای دەکەم، دەخەنێتەوە. پتر لە سروشتی هۆگری دەبم. ئەو و خۆمیش هەست بە هیچ غەریبییەك ناکەین. بە دڵنیاییەوە دەڵێم، لەگەڵ قۆڵەکەی ترمدا لە یەکدی دەچن. لە قۆڵە لەدەستچووەکەم دەچێت. بە دڵنیاییەوە دەڵێم لە یەکدی دەچن،

بەڵام ئەو نییە. بۆ نموونە، یادەوەریی نییە. وەکوو دەرەنجامێکی سروشتیی تازەییەکەی هێڵەکانی ناولەپی نین. لە میانەیانەوە، دەستگرەوان دەزانن ئایندە ناخوێنرێتەوە. نە ئایندە و هەڵبەت نەیش ڕابردوو. لە یەکتر دەچن، بەڵێ، بەڵام ڕاستە و ڕاستە. مەبەستم، با ڕاستگۆ بم، نەرمی نازانێت. ناتەواوە، بێ ئەوەی ئەوە ناتەواویی بێت، جێپەنجەی هەڵگرتووم. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، لەسەری ڕادێم، دەبێت بە بەشێك لە من.

بەر لە نووستن، چەشنی منداڵێك، حەکایەتی بۆ دەگێڕمەوە. بۆ نموونە پێی دەڵێم، گۆرانییەکمان هەبوو و ون بوو. بۆ نموونە پێی دەڵێم، سەمایەکمان هەبوو و بزر بوو. پێی دەڵێم، زمانێکمان هەبوو ون بوو. بۆ نموونە حەکایەتی ترسناکی بۆ دەگێڕمەوە. حەکایەتگەلێك وەکوو دەبینی، هەمبەر نەتەوەیەك خوێن دەپەرستن. گۆمی لێ چێ دەکەن و خۆیانی تێدا دەشۆن. لە گۆمی خوێنە ڕژاوەکاندا خۆیان لە گیانپیسی پاك دەکەنەوە. شەوانیش، قوربانیی نوێ پێشکەش بە گۆمەکە دەکەن.

باسی پەیکەری جووڵەدار بۆ قۆڵم دەکەم. مەبەستم نییە، لەوانەشە مەبەستم بێت یادگەی بۆ چێ بکەم. وا بزانم، وەکوو ئافرەتێکی گەشبین خوێنی تێدا دێ و دەچێت. خوێنی لە ڕێگە ڕژاو، ڕەنگە بگاتە قۆڵم. دوور نییە بگات و ژیانی بۆ بگەڕێنێتەوە. وا بزانم، بە گوناه نەبێت، خوێنی تێدایە. نازانم، لەوەیە بزانم، هی کەسێکی تر بوو. باوەڕیش دەکەم، هەندێك جاریش باوەڕ ناکەم، یادەوەریی هەبێت. بە دڵنیاییەوە، هەرچەندە دڵنیاش نییە، گوێی لێمە. لە شەویشدا، نیوەشەو، بە توندی ئامێزم لێ دەدات. هەندێك جاریش دەست بە ڕوخسارمدا دەهێنێت. لەبری ناولەپی دایکم دەستم پێدا

دەهێنێت. دایکم، قۆڵیشم دەزانێت بەبەر چاومەوە کوژرا. دایکم، وەکوو قۆڵم ئاگەدارە، لە مەیدان لەسەر ملپەڕێن (مقصلة) کۆتایی هات.

وەکوو ئەندامێکی غەوارە و نامۆ، ڕەنگە قۆڵی دایکم بێت، وام لێ دەکات هەست بە هاوڕێیەتی بکەم. بەشێك لە کەسێك هاوشانمە بۆ کوێ بڕۆم. بەشێك لەگەڵ جیاوازی لە لێکچووندا، لە نەوەی باپیرە دەچێت. بەشێکیش لەگەڵ جیاوازی لە لێکچووندا، لە سەگی خاتوونەکە دەکات. بەشێك، لەگەڵ کەمێك جیاوازیدا، لە پشیلەی کیژەکە دەچێت. ئەندام، بە وەسفێکی ورد، ئەڵتەرناتیڤە. بۆ ئەوەی ڕوون بدوێم، ئەڵتەرناتیڤ نییە بۆ ئەندامێك. بەڵکوو ئەڵتەرناتیڤە، با ڕوون بدوێم، بۆ بوون. ئەندامێك لە نێوان لێکچوونەکانیدا، مانای دەستەواژەکەیە. ئەندامێك شوێنی دەلالەت دەگرێتەوە. قۆڵە دارینەکەم، بەپێی تێگەیشتنم، ساختە نییە. قۆڵە دارینەکەم مادەکانی هەمەڕەنگن. بەڵام هەمەڕەنگی، وەك بزانم مانای ساختەکردن ناگەیەنێت. قۆڵە دارینەکەم، پێچەوانەی سروشتییەکە، ئازارم نادات. قۆڵە دارینەکەم، پێچەوانەی ونبووەکە، خوێنی لێ نایەت. قۆڵە دارینەکەم، بێ سەرئێشە، بەرکەماڵیم پێ دەبەخشێت.

بۆ سەرلەبەیانی، لەبەر پەنجەرەکە دەوەستم. لە پەنجەرەکەوە تەماشای هاموشۆکەران دەکەم. بە خدێی خۆم، ئاماژە بۆ هیچ کەس دەکەم. بە قۆڵێك ئاماژە دەکەم دەزانم دوای کەمێك دەکەوێت. باوەڕیش دەکەم، تەنیا خۆم باوەڕ دەکەم، سروشتییە. هەر خولەکێك و دەیجووڵێنم، چونکە سروشتییە. زوو زوو دەستی پێدا دێنم، چونکە سروشتییە. ڕێ دەکەم، بە شەقامەکەدا ڕێ دەکەم، بە تەنیا ڕێ دەکەم، بە دڵنیاییەوە قۆڵە سروشتییەکەیە.

# 40

**باوکم مرد...!**

چلەمین شەو هات بۆ لام. تەوێڵی ماچ کردم، من نووستبووم. هەستم بە گەرمیی هەناسە و جووڵە لەسەرخۆکەی کرد. بە لەشقورسی و بزەخەنەوە لێم ڕوانی. بۆ بەیانی، هەر هێندەی ڕابووم و خۆم بە ژوورەکەیدا کرد، بینیم لەسەر قەرەوێڵەکەی ڕاکشاوە. قەرەوێڵەکەی لە ژێرزەمینەکە بوو نەك لە ژوورە نهێنییەکەی سەرەوە. بەتەنیشتییەوە، تێبینیی کاغەزێکی قەدکراوم کرد. کاتێك کردمەوە سپی بوو. سپیی تەواو نا، پاشماوەی مەرەکەبی پێوە بوو. کاغەزە تازەکە، بەپێی دیتنم نووسینی کۆنی لەسەر نووسرابوو. نووسینێك بە شێوەیەك هەڵگیرابوو نەمزانی چۆن. ئاخۆ نووسینەکە هەڵگیرابوو، یاخود هەر بوونی نەبوو؟ ئایا نووسینەکە سڕابووەوە، یاخۆ هێشتانەکینێ ماوە، بەڵام من نایبینم؟!

کاغەزەکەم لە شوێنی خۆی لێ گەڕا و لە باوکم نزیك بوومەوە. باوکم تاکوو ملی داپۆشرابوو. چونکە من پێشتر مردووم نەبینیبوو، وام هاتە بەرچاو نووستووە. کەچی ڕوخساری،

که وا دیار بوو به پێچەوانەی گشت ڕۆژانی پێشوو حەساوەیە، ئاشکرای کرد. بۆ چەند خولەکێك بە بێدەنگی لێی ڕامام، بەر لەوەی بە خۆم بڵێم، یاخود بە ئەو بڵێم، باوکم مرد. چەندپاتم کردەوە، لە چوارەمین جاردا گریام. لە ساتێکدا هەستم بە هەتیویی خۆم کرد. دایکمم بە بیردا هات، یادگەم لە دوورەوە یادگەمی بیر دەهێنامەوە. دەق لەو ساتەدا، سیما و شێوە و دەنگ و ڕۆیشتنەکەیم بیر هاتنەوە. تەنانەت کراسە درێژە ئاسمانییەکەیم بیر هاتەوە. بێ ویستی خۆم بە جووڵەیەك پەنجەرەکەم کردەوە. لە ساتی خەمگینیمدا بیرم لەوە کردەوە دوا شنەی با بە باوکم ببەخشم. لەو دەمی تەماشای شەقامەکەم دەکرد، هەستی گەورەبوونم لە خۆمدا بە دی کرد. ڕۆژی مردنی باوك پیر دەبین، گوێم لە دەستەواژەیەك بوو بە گوێمدا چرپێنرا، وەك ئەوەی باوك بە درێژایی ژیانی ڕێگەی پیریمان لێ بگرێت.

دراوسێکان بۆ ڕێکاری ناشتنەکەی ئامادە بوون. کابرای دوکاندار مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی دەبێت بۆ شوشتنەکەی ئامادە بم. باوکم وێڕای پیرییەکەی قۆزییەکەی جارانی پاراستبوو. تەنانەت قژە سپییەکەی قۆزییەکی نوێی پێ بەخشیبوو. یارۆی مردووشۆری دڵڕەق جلەکانی لەبەر داکەند. لەو نێوەدا مۆرێکم لەسەر سکی باوکم بینی. لە نێو بازنەیەکی مۆری خڕدا، توانیم وشەی "مۆریسکی" بخوێنمەوە. هەمان وشەی چاپکراو لەسەر سکی من. هەمان پەیڤ ڕەنگە لەسەر سکی دایکیشم ببینم. بۆ دوامین جار ئاو و سابوون بەسەر جەستەی باوکمدا کرا. لەو دەمەدا من یارمەتیی یارۆی مردووشۆرم دەدا، جەستەی باوکمم بۆ گرتبوو. دەستم بە قژی باوکمدا هێنا و لە هۆش خۆم چووم.

لە کاتی بوورانەوەکەمدا، خۆم لەگەڵ دایك و باوکمدا بینی، بە شارێکدا دەڕۆین شەقامەکانی تەنگ وماڵەکانی نزم بوون. من زۆر منداڵ بووم، بەسەر شانی باوکمەوە بووم، پێیەکانم تاکوو نزیك سکی شۆڕ بووبوونەوە. بە دڵی خۆشی یەکێکەوە لە شوێنێکی بەرزەوە تەماشا بکات، لە شەقامەکەم دەڕوانی. لە کاتێکدا دایکم لە نیگاکردنم و زەردەخەنە نەدەکەوت. لەپڕ، لە بەردەم ماڵێکدا ژمارە 97ی هەڵگرتبوو، باوکم وێستا. بە دەستی ڕاستی ئاماژەی بۆ ماڵ و ژمارەکە کرد. گوتی: ماڵی خۆمان. دوای ئەوەی تێپەڕمان کرد، ئاوڕم دایەوە تاکوو ژمارەکەی لەبەر بکەم، بینیمی لە بانیژەکە وێستاوم بە نیگایەکی کلۆڵانە و بە خەمێکی قووڵەوە بە دیی کردم. بە گەیشتنمان بۆ سەرەتای شەقامەکە، دایکم لە چاو ون بوو. کاتێك بە لێدانی پێم لە باوکمم پرسی، باگۆی نەدامەوە. بە شەقامێکی بڵندا سەر کەوتین، تاکوو گەیشتینە گۆڕەپانێکی بچووك. گۆڕەپانەکە کاتدرایەکی گەورەی لێ بوو. باوکم بە قامکی ئاماژەی بۆ کرد و یەك دوو وشەی گوت، گوێم لێ نەبوو. لە بەردەم کاتدرایەکە شانۆیەك و حەشاماتێکی لێ بوون. لەسەر شانۆکە سترانبێژەکان دڵگەرمیی دایگرتبوون و خرۆشابوون، مۆسیقایەکی بڵند دەبیسترا. لە شەقامێکی بەرزی تردا باوکم لەسەر ڕۆیشتن بەردەوام بوو. شەقامەکە درێژ بوو، هەستم بە قورسایی خۆم دەکرد بەسەر ملی باوکمەوە. هەوڵم دا بە دابەزین ڕازیی بکەم، ڕەتی کردەوە. لەسەر گردێکی زۆر بڵند، باوکم لە ڕۆیشتن وێستا. جارێکی دی بە پەنجەی دۆشاومژەی ئاماژەی بۆ پێشەوە بۆ خانووە لە بەرد

هەڵکۆڵراوەکان کرد. ئاماژەی بۆ دواوە بۆ دوکانێکی گەورە و داخراو کرد، تەختەکەی کۆن، بەڵام پتەو بوو. لەوێ باوکم لەسەر شانی دایگرتم. گوتی "ئەمە وەرشەی عەبدوڵلای باپیرتە".
ئیدی بە وێستاوی جێی هێشتم و لە چاو ون بوو.

## 41

باوکم گرێبەستی خانووەکە و کۆمەڵێك وێنە و میرانە (رسوم)ی بۆ جێ هێشتم.

باوکم مرد و خانووەکەم فرۆشت. تەنیا گرێبەست و وێنە و میرانەکانم بۆ مانەوە. تەنیا سێبەری ئەو شتانە مابوونەوە وام دەزانی بێدەوامن. چۆن ماڵەکە گۆڕا بۆ گرێبەستێك و تەواو. چۆن باوکم بووە تەنیا وێنەیەکی ڕەش و سپی؟!

# 42

**له کاغەزەکانی ئایشه دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٥٢٤**

## (2)

دایکم وێڕای ئەوەی کۆچی دوایی کردووە، ڕایسپاردم ماڵەکە بڕووخێنم. لە نێو ئەو قسانەی گوتنی، خانووەکە بڕمێنە. گوتی، کاشکێ نەیگوتایا، تاکوو دوابەردی هەڵتەکێنە. دایکم پێچەوانەی نەریتی خۆی ڕایسپاردم، شتێك بکەم. دایکم، کە لە ژیانیدا فەرمانی بەسەردا نەکردووم، ڕامدەسپێرێت. ئەو دایکەی فەرمانی بەسەردا نەکردووم، فەرمانم بەسەردا دەکات. بە کراسێکی ڕەنگاوڕەنگی شۆڕەوە، بە پێچەوانەی خدێی خۆیەوە هات. دایکم، ئەوی بیناسێت، تەنیا ڕەشی لەبەر دەکرد. دوای بیست ساڵ بە ڕوخسارێکی گەشەوە هات. دوای بیست ساڵ بە سیمای لاوێك بە دوو کەزییەوە بەسەر سینگیدا شۆڕ بووبوونەوە هات. لە ساتی بێئومێدیدا هات، تاکوو ڕامسپێرێت خانووەکە بڕمێنم.

خانووەکەی ڕاسپێررابووم بیڕووخێنم، ماڵەکەمان بوو. خانووە بەهێز و پتەوە سێ نهۆمییەکە. ماڵە کۆنەکەی باپیرم بنیاتی نابوو. باپیرم، ئەوی نازانێت باوکی دایکم. دایکم، ئەوی

نازانێت مەریەمی کچی عەبدوڵلای کوڕی محەمەد دی مۆلینا.
باپیرم، ئەوی نازانێت، خاوەنی دوکانی ئاسنگەری بوو، خودان
کتێبخانەی کۆنکە بوو. کتێبخانەی کۆنکە، لە تاشەبەرد
هەلکۆڵراوە، تژییە لە نهێنی. کتێبخانەی کۆنکە، لە تاشەبەردێك
هەلکۆڵراوە، کەوتووەتە گەنجینەی ژێرخانی ماڵەکە.

دایکم، پێچەوانەی باپیرم، لە کتێبخانەکە دەترسا. دایکم،
پێچەوانەی باپیرم لە کتێبخانەکە نزیك نەدەبووەوە. باپیرم، لەبەر
زەنگینییە سەرچاوە دیارەکەی ناسراو بوو، خانوویەکی چێ کرد.
باپیرم، لەبەر هۆکاری دەروونی، شارێکی پەراوێزخراوی
هەلبژارد. باپیرم، لەبەر هۆکاری کرداری، سێ نهۆمی بنیات نا.
باپیرم، وا بزانم بیری لە دوو نهۆم کردەوە بۆ دوو کچەکەی.
باپیرم، ڕەنگە دوای ئەوە، بیری لە کڕینی خانوویەك کردبێتەوە
بۆ عاسم و محەمەد. عاسم و محەمەد، بۆ ئەوی نازانێت خاڵمن.
لێ چارەنووس، چارەنووسی نادیار، تەنیا کچێکی هێشتەوە.
کیژەکەی تر، پوورم، بە منداڵیی مرد. دایکم، وێڕای
سلکردنەوەی لە کتێبخانە، لە خانووەکەدا ژیا. دایکم، وێڕای
سلەمینەوەی لە کتێبخانە، هاوسەرگیریی لە ماڵەوە کرد. دایکم،
سەرەڕای سلکردنەوەی لە کتێبخانە، ئێمەی لەو ماڵەدا بوو.
براکەم و منی لەو ماڵەدا بوو. خوشکەکەم، وەکوو پوورم، منداڵ
بوو مرد. خوشکەکەم، پوورمئاسا، نەمبینی. خوشکەکەم، بەپێی
قسەی دایکم، بەر لە هاتنەدنیای من بە دوو ساڵ مرد. منیش
چەشنی دایکم، لە ماڵەوە مامەوە. مامەوە، وەکوو دایکم لە
کتێبخانە دەترسێم.

دایکم، بە ڕۆیشتنە زووەکەی، بیست ساڵە ونە. دایکم، لە
ماوەی ئەو ساڵانەدا، بە یەکجاری دیار نەما. مەبەستم، بۆ ئەوەی

ورد بم، له خەونەکان ون بوو. ئەو ڕۆژەی دایکم کۆچی کرد، تاکوو نەڵێم مرد (ئایا له سێداره درا؟) لێم دابڕا. دابڕا، مەبەستم، بۆ یەکجاری دابڕا. باوکم، پێچەوانەی دایکم، دەهاته خەونم. باوکم، وێڕای جیاوازیمان، سەری لێ دەدام. دایکم، سەرەڕای ئەوەی به پیرۆزم دەزانی، بزر بوو. باپیرم، دەبێت ئەمه بگوترێت، له وێنەکان بیرم دێتەوه. ماڵەکەمان، تەنیا خەونم بەوەوه دەبینی. من، من کێم؟! لەسەر مردوو ئامادەکردن دەژیم. ئەو مردووانەی به فەرمانی قەشەکان. ئەو مردووانەی به فەرمانی پاشا. مردووەکان له سەر تاتەشۆرەکانن.

# 42

**لە کاغەزەکانی ئایشێ دی مۆلینا**

**کوێنکا/ ١٥٢٤**

## (3)

دایکم، ڕەنگە ئەمە سوودێکی هەبێت، لە چلساڵیدا کۆچی دوایی کرد. واتا، لەگەڵیدا ئەوەش دەگەیەنێت، سی و هەشت ساڵان بوو. لەگەڵمدا بیهێنەوە بیری خۆت، دایکم بە ناو پوورمەوە ژیا. لەگەڵمدا بیهێنەوە بیری خۆت، دایکم بە زایینامەی پوورم ژیا. لەگەڵمدا بیهێنەوە بیری خۆت، دایکم بە زایینامەی پوورم ژیا. بیرت نەچێت دایکم ژیانی پوورم ژیا. لە بیرت بێت، دایکم لەبری یەکێکی دی ژیا.

کاتێك دایکم کۆچی کرد، تاکوو نەڵێم مرد، من بیست ساڵان بووم. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت هەژدە ساڵان بووم. لەگەڵمدا بیهێنەوە بیری خۆت، من بە ناو خوشکەکەمەوە دەژیم. بیرت نەچێت من بە زایینامەی خوشکەکەمەوە دەژیم. لەگەڵمدا بیرت بێت، من ژیانی خوشکەکەم دەژیم. لەبری ئەو دەژیم. کەواتە، دوای بیست ساڵ، دایکم سەرم لێ دەدات. دایکم، کاتێك چل ساڵان بووم، سەرم لێ دەدات. سەرم لێ دەدات و ڕامدەسپێرێت خانووەکە بڕمێنم. خوشکەکەم ڕادەسپێرێت!

وێنەی خوشکەکەم بە کۆرپەیی لەسەر دیوارەکە کێشراوە، وێنەی خوشکم لەسەر دیوارەکە بە وێستاوی کێشراوە، وێنەی خوشکەکەم، چەشنی پشیلەیەك تەماشای سەرەوە بکات، بە ئامێزی دیوارەکەوەیە. وێنەکانی منیش، بە تەنیشت وێنەکانییەوە لە هەمان دۆخدان. وێنەکانم، لە هەمان تەمەندا بە تەنیشت وێنەکانیەوەن. لە وێنەکاندا، خوشکەکەم و من، لە یەکدی دەچین. لە وێنەکاندا، خوشکم و من، هەر دەڵێی دووانەین. لە وێنەکاندا، خوشکەکەم و من، دەڵێی هەمان کۆرپەین. لەسەر دیوارەکە، دیواری داڵانەکە، بە تەنیا گەورە دەبم. لەسەر دیوارەکە خوشکەکەم لە گەشەکردن دەوەستێت. لەسەر دیوارەکە وەکوو لاوێك بزەخەنەم کردووە. لەسەر هەمان دیوار، بە سەرکەوتنەوە دەخەنێمەوە. لەسەر دیوارەکە لە بەردەم کتێبخانەکەدا وێستاوم. لەسەر دیوارەکە قژم سپی دەبێت. لەسەر دیوارەکە، دیواری داڵانەکە، خوشکەکەم منداڵیی خۆی دەپارێزێت.

لە ساتێکدا، لە ساتێکی دەگمەندا، هەست بە تەڵە دەکەم. هەست دەکەم، بۆ نموونە، ئەوی مرد من بووم. هەست دەکەم، بۆ نموونە، من خوشکەکەمم. هەست دەکەم، وا بزانم، من خوشکەکەمم. خوشکەکەم، ئەوە خوشکەکەمە ئەم ژیانە دەژی. من خۆم، لە گۆڕیش چاوم لە خوشکەکەمە. هەندێك جاریش هەست بە فێڵێکی تر دەدەم. هەست دەکەم، خوشکەکەم ژیانی پێ بەخشیم و هەڵات. هەست دەکەم، وا دەزانم، ئاڵوگۆڕەکە بێ ویستی خۆم ڕووی دا. هەست دەکەم، وا دەزانم، من لەم ئاڵوگۆڕەدا دۆڕاوم. هەست دەکەم، دایکم فێڵێ لێ کردم. دەڵێم، بە دڵنیاییەوە بە خۆم دەڵێم، دایکم چارەنووسی خۆی بە

میرات بۆ جێ هێشتم. دەڵێم، دایکم چارەنووسی خۆی بە میرات بۆ جێ نەهێشتم. دەڵێم، لە دڵی خۆدا دەڵێم، ئەوە پوورم بوو ئەمەی کرد. دەڵێم، چونکە دایکم دایکی من نەبوو. دایکم، وەکوو بزانم، پوورم بوو. دایکم پوورم بوو وەك چۆن من خوشکەکەم بووم. تەماشا دەکەم، ئێستا تەماشای پێکەنینی خوشکەکەم دەکەم. دەرك دەکەم، وەکوو چۆن هەندێك جار دەرك دەکەم، گاڵتەم پێ دەکات. وەك ئەوەی خوشکم، بە لێکدانەوەیەکی دی، دەرکی بە ژیان کرد. لە دوورەوە دەرکی بە ژیانی کرد. دەڕوانم، ئێستا لە زەردەخەنە بێگوناهانەکەی دەڕوانم. دەزانم دڵخۆشە. لە تەنیایی خۆمەوە دەرك بە دوورکەوتنەوەی دایکم دەکەم. ئێستا نەك پێشتر، لە سەرهاتەکانی دایکم دەربارەی خوشکەکەی تێدەگەم.

# 43

**له كاغەزەكانی ئایشە دی مۆلینا**

**كوینكا/ ١٥٢٤**

**(4)**

لەسەر دیوارەكە، دیوارەكەی بەرامبەر، وێنەی دایكمە. لەسەر دیوارەكە وێنەی پوورمی پێوە هەڵواسراوە. دایكم و پوورم لەسەر دیوارەكەن، دوو منداڵی قشتۆكەن. دایكم و پوورم، لە وێنەی جیاجیادا، بۆ ژیان دەخەنەوە. پاشان دایكم، تەنیا دایكم، لاوە. پاشان دایكم لە شەوی بووكێنیدا بە دەوریدا سەمای تامبرا دەكەن. دایكم كۆرپەیەكی بە باوەشەوەیە. نازانم، بە دیاریكراوی نازانم، ئاخۆ من كۆرپەكەم، یاخۆ خوشكەكەم. هەندێك جار، زۆر جار، دایكم پێشنیازی بۆ پوورم دەكرد. دایكم، لە بڕیارە چارەنووسسازەكاندا تێبینیی بە پوورم دەدا. دەیپرسی، لە نێو پرسیارەكانیدا، ئاخۆ ئەوی دەیكات دڵخۆشی دەكات. دایكم، بۆ دوامین سات، لەبری ئەو دەژیا. منیش، لە شوێنەكەی خۆم لە حەوشی ماڵ، لە وێنەی خوشكەكەمم دەڕوانی. تەماشام دەكرد، بە دیاریكراوی ئێستا، تاكوو بۆ ڕووخاندنی خانووەكە ڕێگەم پێ نیشان بدات.

دایکم، لە دەرکەوتنە شەبەنگییەکەیدا، یەکلاکەرەوە بوو. وەکوو چۆن لە ژیاندا یەکلاکەرەوە بوو. دایکم، بەو جوانییەوەی دڵی وێران دەکرد، ڕاسپاردەی خۆی گوت. دایکم، دوای مردن، لاوتر بووەوە. ئاخۆ مەرگ، بەو پێیەی من بینیم، خولانەوەی ڕەورەوەی زەمەنە بۆ دواوە؟ ئاخۆ مەرگ، بە بەڵگەی دایکم، ژیانە لە زەمەنێکی دی؟ باوکم، لە دەرکەوتنەکانیدا، گەنج بوو. بەڵام باوکم، تەنانەت لە پێگەیشتنیشیدا هەر گەنج بوو. باوکم، ڕۆژی کۆچی دوایی، گەنج بوو. دایکم، وێڕای جوانییەکەی، پێگەیی بوو. ئەوی دەیناسی دیار بوو ئافرەتێکی خەملیوە.

ئاخۆ خوشکەکەم، بۆ نموونە، لەوێ پێی دەگات. ئایا بۆ نموونە خوشکەکەم، لەوێ دەیانبینێت. ئایا لەوێ، بۆ نموونە، خێزان پێك دەهێنن. ئایا من، بەلای خانەوادەکەمەوە لەوێ، تەنیا مردوویەکم و هیچی تر؟

ڕاسپاردەی دایکم، بە ڕووکەش، ڕووخاندنی خانووەکە بوو. بەڵام خانووەکە بە بۆچوونی خۆم، لەوانەیە ژیان بێت. تێکدانی خانووەکە، ڕەنگە هێمای ڕووخاندنی یادگە بێت. ڕووخاندنی خانووەکە، لەوەیە سڕینەوەی ئاسەواری باپیرم بێت. دوور نییە سڕینەوەی ئاسەواری باوکم بێت. ڕەنگە سڕینەوەی ئاسەواری من بێت. نهۆمی یەکەم، نهۆمی باپیرم، تاکوو ئێستا داخراوە. هێشتا بەڵگەنامەی نهێنیی تێدایە. بەڵگەنامە، یاخود دەستنووسەکان، باس لە مێژوویەکی نەزانراو دەکەن. باپیرم، هەروەها خاڵم محەمەد و عاسم و مەروانی برام، یادەوەریی خۆیان دەنووسنەوە. منیش چەشنی باپیرم و خاڵم و مەروانی برام، یادەوەرییەکانم دەنووسمەوە. هەرچی دایکمە پێچەوانەی

من و باپیرم و خاڵم لە تۆمارکردن دەترسێت. دایکم وای دەبینێت، ڕابردوو مەترسیدارە. بەڵام دایکم، وەکوو خۆم، لە ماڵێکدا دەژیا لە سەرووی کتێبخانەیەکەوە دروست کرابوو. تاقە دەربازبوو لەم گومۆکەیە خوشکەکەم بوو. تاقە قوتاربوو لە گشت تەڵەکان خوشکەکەمە، بۆ ئەوەی بیرم نەچێت پووریشم.

ئایا لە ڕاستیدا ئەوە خوشکەکەم بوو ڕزگاری بوو؟! ئایا ڕاستییەکەی ئەوە من نەبووم قوتارم بوو؟! ئەی ئەوە نییە خوشکەکەم ئێستا دەژی؟! ئەوە من نیم بە هەڵگرتنی ناوی خوشکەکەم و مێژووی لەدایکبوونی، ژیانی ئەو دەژیم؟

کەواتە ڕاسپاردەی دایکم ناشەرعییە. بەپێی ڕێسا ڕاسپاردە دەبێت لە خوشکەکەمەوە بێت. دەبێت بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ خوشکم ڕامبسپێرێت. وەکوو دایکم یان یەکێك لە شوێنی ئەو ڕامبسپێرێت خانووەکە بڕووخێنم. بەڵام دایکم، دایکم خۆی، دایکی من نییە. دایکم هەر بە خۆی پوورمە. ئەمەش شیمانەیە، شیمانەیەکی بەجێیە، وەکوو شیمانەی دەرکەوتنی دایکم.

ئێستا دەجووڵێم، بێ ویستی خۆم دەجووڵێم و بیر لەوە دەکەمەوە. شێتانە لە ژێرزەمینەکە دەگەڕێم. وەکوو یەکێك پێش زەمەن بکەوێت هەموو دەستنووسەکان دەکەمەوە. وێنە کێشراوەکان کۆ دەکەمەوە و خۆم بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکەم. شەکەت و ماندوو لەسەر عەردەکە دادەنیشم. بە هەردوو دەستم سندووقی بەڵگەنامەکان ڕادەکێشم. بە ویژدانی ئاسوودەوە ئەو واژۆیانە دەخوێنمەوە بە ناوی خوشکەکەمەوەن. لەو نێوەدا لە ڕاسپاردەکەی دایکم دەگەم. دایکم پێچەوانەی ڕووکەش ڕامناسپێرێت. دایکم، لە ناخەوە خوشکەکەم ڕادەسپێرێت.

له پەنجەرە بچووکەکەوە تەماشای شەقامەکە دەکەم. له شەقامەکە هەندێك سەر بە سەرپەرژینەکانەوە هەڵواسراون. لە گۆڕەپانەکە، گۆڕەپانی کوینکا، سەری خزمەکانم دەکەون. سەرە هەڵواسراوەکان، بە دەنگێك هاوار بۆ ژیان دەکەن، سوێند دەخۆن لە مانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژوو نەبوونە. سەرە هەڵواسراوەکان بە نائومێدییەوە ماڵئاوایی لە ژیان دەکەن. دایکم کاتێك شەبەنگی ئەو لە گۆڕەپانەکەدا دەسووڕێتەوە، فەرمانم پێ دەدات خانووەکە تێك بدەم. منیش چەشنی باپیرم، دەستنووسێکی تازە دەپەستمە ژێرزەمینەکەوە.

# 45

**له كاغەزەكانی ئایشێ دی مۆلینا**

**كوینكا/ ١٥٣٠**

**(5)**

زەوی، سەرتاپای زەوی وەك گردەلم وابوو. خەڵكەكە ململانێیان دەكرد لە ڕۆیشتن بەسەریدا. وای لێ هات خەڵكەكە بۆ ئەوەی بكەونە ناویەوە شەڕیان دەكرد. منیش هەر خۆم لە پەنجەرەكە وێستابووم. من، تەنیا بووم، بە ترسێكی كوشندەوە لە شەقامەكەم دەڕوانی. لەپڕ، یاخود بە شێوەیەكی چاوەڕوانكراو هاوارم كرد. لە هیكڕا، یاخود وەكوو هەموو جار، دەنگ لە گەروومەوە نەهات. ئیدی كەوتمە ئاماژەكردن بۆیان. وەكوو هەموو جار بە قۆڵێكەوە ئاماژەم دەكرد. بە جووڵەگەلێكەوە ئاماژەم دەكرد پێشتر نەمكردبوون. بە دەنگی كپ هاوارم دەكرد. وەكوو زەنگ ڕادەپەڕیم. لێ هەموویان و تاك بە تاكیان، ئاوڕیان لێ نەدامەوە. گشتیان، یەك یەك، بەرەو ڕووگەیەك دەڕۆیشتن شارەزای بوون. منیش وەكوو هەمیشە، شارەزا نەبووم. دەتگوت زەوییەكی جووڵاو دەبڕن بۆ ئەوەی

بگەنە بەهەشتی ئارەزووکراو. چون بەهەشتە خوازراوەکە، خۆ لەوانەیشە وا بوو بێت، ئازایەتیی بڕینی مەترسییان پێ ببەخشێت. بەڵام من، جەخت دەکەمەوە، هیچ بەهەشتێکی ئارەزووکراوم نەدەبینی. هیچ کەسێکیشم نەدەبینی بتوانێت بپەڕێتەوە. لە پشتیشمەوە، قیژە و هاوار بوو. لەپشت منەوە، هاواری مەرگ بوو. مەرگیش، وەکوو دەبیسم، لە هەموو شوێنێکی دنیادا هەیە. لەبەر هۆی جیا جیا، مردن ڕووی دەدا. من کەوتنی پلە بە پلەم دەدی. هەروەها دەمبینی، بە تەنیا کەوتنی حەتمیم دەمبینی. پێیەکان ڕۆ دەچوون، پێیەکان لە زەویی جووڵاودا لە چاو ون دەبوون. زەویی جووڵاو، وای دەنواند سەقامگیرە، ئەوی بەسەریەوە بوو هەڵیدەلووشی. بە توندی ئەوی بەسەریەوە بێت قووتی دەدات. وەکوو تەماشاکەرێکی نەرێنی دیارنەمانی جەستەکانم دەبینی. وەکوو بینەرێکی نەرێنی هانابۆهێنانم دەبینی. وەکوو بینەرێکی نەرێنی، تەماشاکەرانی ترم دەبینی بە تەنیشت ئەوانی خۆیان شاردبووەوە. تەماشاکەرانی چەشنی من، دەستی یارمەتییان درێژ ناکرد. وەکوو بۆی دەچووم، دەستیان درێژ ناکەن، چونکە هەمان چارەنووسیان تووش دێت. بۆیە دەستیان درێژ ناکەن، ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت مژوولی پەڕینەوەن.

لەو نێوەدا، لەوانەیە پێش ئەوەش، لەوێ بووم. لەوکاتەدا لەسەر زەوییە جووڵاوەکە بووم. لەودەمەدا، تەواو لەو کاتەدا، ململانێم لەسەر پەڕینەوە دەکرد. من ململانێم دەکرد و ئەوانی نزیکم پاڵیان دەنام. بە توندی پاڵیان دەنام، منیش پاڵم دەنا. پاڵیان پێوە دەنام و منیش ئەوانی پێش خۆمم پاڵ دەنا. لە ساتێکدا، لە ساتێکی حەتمیدا، زەوییەکە هەڵی لووشیم. لە ساتێکدا، لە

ساتێکی حەتمیدا، تەماشای پەنجەرەکەمم کرد. لە ساتێکدا بە دەنگی کپەوە هاوارم دەکرد. بە قۆڵی دارینەوە ئاماژەی بەهاناهاتنم دەکرد.

جەستەم، جەستە لاوازەکەم، لە گەشتێکی ژێرزەمینیدایە. سەرم بە حەسرەتەوە لە دنیای دەڕوانی. لەو دەمەدا، ڕێك لەو دەمەدا هەستم کرد یەکێك خۆی بە لاقەکانمەوە گرتووە. هەستم کرد یەکێك بەرەو خوارەوەم ڕادەکێشێت. ڕامدەکێشێت و دەڵێت: با لەدەست مردن هەڵبێین. بێئاگا، یاخود بە ئاگاوە، تەماشای پەنجەرەکەمم کرد. تەماشام دەکرد و خۆم بینییەوە بە دەنگێکی کپەوە هاوار دەکەم. خۆم بینییەوە بە جووڵەیەکی لاواز ئاماژە دەکەم. کاتێك سەرنجی تیژم دا، دەرکم کرد، بێ سەرسوڕمان دەرکم کرد لە پەنجەرەکەم. بێ سەرسوڕمان دەرکم کرد من مردووم. لەو کاتەدا تاکوو لووتم زەوییەکە دایپۆشیم. لەو نێوەدا تەنیا چاوانم مانەوە. بە ددانپێداانانی خۆم، جووتێك چاوی نیمچە داخراو. لەو کاتەدا تەماشای پەنجەرەکانی دەوروبەرم کرد. تەماشاکەران مردبوون. دەمی داپچڕیویان دەرگەی گۆڕ بوون، دەستە ڕەقەکانیان دەستی کیژێك بوون.

بە بێئاگاییەوە بەرەو بانیژەکە ڕۆیشتم. بێئاگا لە شەقامەکەم ڕوانی. بە دوو چاوی کزەوە ڕۆیشتنی هاموشۆکەرانم بینی. ئەوانیش بێئاگا بە ئارامی ڕێیان دەکرد. دوور لە نەریتی خۆیان، تەماشای ماڵە چۆلەکانیان دەکرد. هاموشۆکەران، پێچەوانەی نەریتی خۆیان، سڵاویان لە یەکتر دەکرد.

تەنیا ڕێیان دەکرد. بە ترسێکی نەزانراوەوە لە ئەملا و ئەولای خۆیان دەڕوانی. لەپڕ هاموشۆکەران کەوتنە ڕاکردن. لە ناکاو

ژمارەیان زیاد بوو. خەریك بوو لەسەر شتێك خڕ دەبوونەوە. بە پاڵنانەوە لەسەر شتێك خڕ دەبوونەوە نەمدەبینی. لە چەند خولەکێکدا هەرایان بڵند بووەوە. لە چەند خولەکێکی کەمدا، دراوسێکان لە پەنجەرە و بانیژەکانەوە سەریان دەرهێنا. لە چەند خولەکێکدا دەکەوتن. یەك دوای یەك زەوییەکە لووشی دەدان. لە چەند خولەکێکدا خۆم لە نێویاندا بینییەوە. لەو دەمی لە بانیژەکەوە دەمڕوانی، خۆم بینی زەوییەکە هەڵمدەلووشێت. ئیدی بە دیاریکراوی لەو کاتەدا، دەرکم کرد من مردووم.

# 47

## کاغەزەکانی خوانی کوڕی مانوێلای کچی ئایشە دی مۆلینا
## (خوان دی مۆلینا)
## کوینکا/ ١٦٠٩

### (1)

دەنگی گەلێك تەپڵمان بیست لەگەڵ یەکێك هاواری دەکرد:

- ئەی مۆریسکییەکان خڕ ببنەوە.

لە پەنجەرەکەوە هەواڵەکەمان بۆ هات: "فەرمانێکی پاشایی بە وەدەرنانی مۆریسکییەکان، گشت مۆریسکییەکان دەرچوو". فەرمانەکە بە ناوی کرستیانە تازەکانەوە، یاخود ئەو کرستیانانەی بە بنەچە موسوڵمانن، دەرچووە. مۆڵەت: سێ ڕۆژ. ڕۆژی سێیەم، سەرلەبەیانی، دەبێت لە شەقام ڕیز بین، تاکوو پیاوانی پۆلیس دێن سواری ئەو کەشتییانەمان دەکەن بەرەو چارەنووسێکی نوێمان دەبەن، بۆ خاکێك شارەزای نیین.

لە ماریام پرسی: بە باوەڕی تۆ ئەم فەرمانە ئێمەش دەگرێتەوە؟ بە نیگایەکی بێئاگا و خەمناکەوە بەرسڤی دامەوە: بە دڵنیاییەوە.

ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت لە وڵاتی خۆمان وەدەرمان دەنێن؟

ماریا گریا، ڕابووم و بەرەو دەرگەکە تاوم دا، دوام کەوت. لە ئامێزم گرت و تەوێلیم ماچ کرد. پێم گوت، ئێستا دەبێت قەشەی کوینکا ببینین، با تێبگەین.

دوای چەند هەنگاوێك، ماریا پێشنیازی ئەوەی کرد منداڵەکان لەگەڵ خۆماندا ببەین. "باشترە بە بەڵگەی زیاتر بۆی بسەلمێنین ئێمە موسوڵمان نین". بۆ ئەوەی باری سووك بکەم، بە بزەخەنەوە دەستێکم نایە سەر شانی پێم گوت، ئەو بە بنەچە مۆریسکی نییە، "هەموومان دەردەکەن ماریا تۆ نەبێت". هەڵبەت قسەکە پێچەوانەی مەبەست بوو، پتر خەمباری کرد.

- قەشەی گەورەمان، پێمان بێژە فەرمانە تازەکە چی دەگەیەنێت؟

- ئەم فەرمانە شاهانەیەی ئەمڕۆ دەرچووە زۆر ڕوونە، دەبێت خۆت و خانەوادە و خزمانت خۆتان بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکەن. لە ئێستاوە تاکوو ڕۆژی سێیەم کەشتییەکان بۆ سەرزەمینێکی ترتان دەبەن.

- بەڵام تۆ دەزانیت ئێمە کرستیانین. بە خۆت ئاوەمۆرت کردین، ئێمەش پابەندی نوێژەکان بووین و دوا نەدەکەوتین. بە خۆت لە هەفتەی ئازارەکاندا بینیمانت. باربوو و یارمەتیمان بۆ کڵێسا کۆ کردەوە. ئایکۆن و پەیکەری پیرۆز بە دیواری ماڵەکانمانەوە هەڵدەواسین. بەیانیان و ئێواران ناوی خودا دێنین. منداڵەکانم لێرە ئاوەمۆر کران. باوباپیرانم لێرە ئاوەمۆر کران.

- من دەزانم تۆ کرستیانێکی باشیت. لە هیچ شتێکدا قسوورت نییە. بەڵام هەندێك لە کرستیانە تازەکان کرستیان نین.

لەسەر موسوڵمانیی خۆیان مانەوە، نە بۆ کۆنویژ دێن و نەیش گۆشتی بەراز دەخۆن. سەرەڕای ئەوەش، ڕەمەزانان بەڕۆژوو دەبن. گەلێك لەوانەمان گرت خۆیان بە کرستیان دادەنێن، بەڵام دەست لە ڕۆحیان نەدراوە. ڕۆحیان لە گومڕاییدا ماوەتەوە. ڕۆحگەلێکی شەیتانییان تێدایە. دوای گەلێك لە دادگەکانی پشکنین، لە ئیسلامەتیی بە نهێنی نەکەوتوون. نەك هەر لە کوینکا، بەڵکوو لە؛ غەرناتە، قورتوبە، بلەنسیە، جەییان، ماڵقە، قادش و ئەلمریایش. گەلێکیان پابەندی ئایینە کۆنەکەیان بوون، سەرەڕای ئەوەی پتر لە سەت ساڵ بەسەر کرستیانبوونیاندا تێپەڕیوە.

- ئەوەتانێ بە خۆت دەیڵێی قەشەی گەورەمان، دوای پتر لە سەت ساڵ. چۆن دەبێت دوای سەت ساڵ لە کرستیانبوون هەر موسوڵمان بین؟ ئێمە لە کڵێساکان پەروەردە بووین، لە کڵێساکان گەورە بووین، لە کڵێساکان ژنخوازیمان کرد. تەنانەت زمانی عارەبییش نازانین! ئەوی ئێستا ڕوو دەدات ئیسپانەکان ئیسپان دەردەکەن. ئیسپانەکان ئێستا عارەب دەرناکەن. ئیسپانە کرستیانەکان ئەوانە دەردەکەن بە ئیسپانیی موسوڵمانیان دەزانن. تۆ خۆت باش ئەمە دەزانیت. عارەب نەوە یەکەمەکان بوون، بەڵام دوای ئەم هەموو ساڵ و سەدانە بووینە ئیسپان، هەمانە ئیسپانی کرستیانن و لە ناویشماندا هەن ئیسپانی موسوڵمانن. ئەو زمانەی قسەی پێ دەکەین قشتاڵییە. ئەو خاکەی دەیناسین کوینکایە. ئەو پۆشاکەی دەیپۆشین و ئەو نەریتانەی وەرمانگرتن و ئەو دابانەی پێڕەویان دەکەین، سەرجەمیان هی ئەم خاکەن.

- فەرمانی پاشا ڕوونە: ئیسپانیا وڵاتێکی کاسۆلیکییە تەنیا کاسۆلیکەکانی تێدا دەژین، کارەکەش تایبەت بە کوینکاوە نییە.

موسوڵمانان دەریانخست دەستبەرداری ئایینی خۆیان نابن، ئیدی ئەم خاکە نایانگرێتە خۆی. دەبێت بڕۆن خۆتان ئامادە بکەن، ئەوی دەتوانن لەگەڵ خۆتانیدا ببەن. بوەستە، تەنیا ژنەکەت مافی ئەوەی هەیە بمێنێتەوە، چونکە کرستیانێکی بە بنەچە کرستیانە. هەڵبەت مافی منداڵەکانتە لەگەڵ دایکیاندا بمێننەوە، تەنیا لەبەر ئەوەی منداڵن، نەك لەبەر ئەوەی من باوەڕم بە کرستیانبوون و پاکیی ڕۆحیانە. هەرچی تۆی، وێڕای ئەوەی چەندین جار لە دڵسۆزییت بۆ مەسیح تاقیم کردوویتەوە، ناتوانم لەبەردەم پاشا بەرگرییت لێ بکەم.

کاتی دەرچوونمان لە دەرگەی کڵێسا، قەشە بە دەنگێکی باوکانەوە گوتی: "ئەگەر ئامۆژگاریی منتان دەوێت، با ماریا لەگەڵ منداڵەکاندا بمێنێت".

- ئەی باوکم بڕوات؟

- بەڵێ میگێل، باوکت دەڕوات.

- بۆیە دەڕوات چونکە باپیرانی موسوڵمان بوون؟!

- بەڵێ میگێل، بۆیە دەڕوات چونکە باپیرانی موسوڵمان بوون.

- کەواتە منیش لەگەڵ باوکمدا دەڕۆم، چونکە باپیرانم موسوڵمانن.

- وسبە میگێل، نابێت ئاوا قسە لەگەڵ باوەقەشەماندا بکەیت!

- باوەقەشەمان باوکم دەردەکات دایە! منیش لێرە نامێنم لەبەر ئەوەی وەکوو باپیرانم موسوڵمانم.

بۆ ڕۆژی سێیەم لەگەڵ شیرەی شەبەقدا لە گۆڕەپانەکەی

کوینکادا وێستاین. له گۆڕەپانەکه قەشه و پیاوانی پۆلیس
فەرمانیان دا ماریا و منداڵەکانی بمێننەوه و میگێل لەگەڵمدا
بڕوات.

## 48

**پەراوێز:**

- ساڵی ١٩٩٢، پەرلەمانی ئیسپانی لەسەر پێشنیازێك ڕازی بوو، مافی گەڕانەوە و ڕەگەزنامە بە جوولەکە سەفەردیمە دەرکراوەکانی ساڵی ١٤٩٢ دەدات.

- ئەی مۆریسکییەکان؟

-.......!

# 49

بەهەر حاڵ گەشتەکەم بۆ کوینکا ئاسان نەبوو. لە بەرابەردا مانەوە لە شارەکەمدا ئاسان نەبوو. جەستەی ڕاکشاوی باوکم لە گۆڕستانێکی نزیك ماڵ شەو و ڕۆژ پرسیار و سپاردەی بۆ دەناردم. ئومێد و تەنیایی بۆ دەناردم. جەستەی باوکی ڕاکشاوم لە گۆڕستانێکی نزیك، وەکوو دواتر بۆم دەرکەوت، لە جەستەمدا ڕاکشابوو. لە جەستەمدا هەناسەی دەدا. چاوە بەقووڵداچووەکانی هێشتان کراوە بوون. لە میانەی چاوانی منەوە چاوی لە مەلەکۆتە. ئێستا باوکم لە ڕێگەی منەوە تەماشا دەکات. ئێستا باوکم لە شوێنە دوورەکەیەوە لە مەرگ چاودێریی ژیان دەکات. منیش تەنیا نێوانکارێکم لە نێوان دوو بۆچووندا هیچیان لەبارەوە نازانم، مردن و ژیان!

لە ڕێگە، بیرم لەوە دەکردەوە چۆن لە شارێکدا ڕەگە وشکەکانم ئاو بدەم شارەزای نەبووم. چ شتێك دەکرێت بیکەم دوای ئەوەی مێژووی خۆمم زانی. چی نرخێك پێویستە بیدەم، تاکوو باوکم لە گۆڕەکەیدا بحەسێتەوە. لە گۆڕەکەی، یان لە جەستەمدا. باوکم و باپیرانم. باوك و باپیرانم و من، لەگەڵ ئاشکراکردنی دەستنووسەکاندا گەیشتمە ئەو خاڵەی پێویستە لێوەی بازنەکە دابخرێت. گەیشتم، یاخود وا دەزانم! ئەوی دەیزانم لێی دڵنیام، ئەگەر دڵنیابوون لە شتێکدا هەبێت، لە ڕێگەیەك دەستم پێ کرد کۆتاییەکەی نازانم، لەگەڵ ئەوەشدا لای من گەوهەری ژیانە.

له ڕێگە بەرەو مەدرید، وێستگەی ترانزێتەکەی چەند شەوێکی تێدا دەمێنمەوە پێش ئەوەی دەست بە گەشتەکەم لە وشکانی بکەمەوە بۆ کوینکا، ئایشێ و مەریەم و مانوێل، خوان و مانوێلا و عەبدوڵلا دی مۆلینا، هەر لە بیرم بوون. وای بۆ دەچم ئافرەتانی خانەوادەکەم، بە جوانییە ئەندەلووسییەکەیانەوە، تێکەڵەیەك بوون لە جوانیی هەمەچەشن. جوانییەکی دڵڕاکێش. ئایشێی باریکەلەی بەژندرێژ جیاواز بوو لە دایکە پێستنەرمەکەی. قژە ڕەش و چاوە خڕەکانیان کۆیان دەکاتەوە. سپیاتییەکی گەنمڕەنگی کۆیان دەکاتەوە. کارلۆس هێند لە عەبدوڵلا جیاواز نەبوو. ڕەنگە خوان هیچی لە عەرەبی نەزانیبێت تەنیا پیتەکانی نەبێت، بەڵام پێکهاتەکەی ئەندەلووسی بوو.

زمان بەشێکە لە ناسنامە. نووسینی خوان بە زمانی "ئەلخامیادۆ" هەر بەڵگە نییە لەسەر ئەم ناسنامە تواوەیە، بەڵکوو مکوڕبوونیشە لەسەر پاراستنی بە تواوەیی. ناسنامەی باپیرانم، بە تایبەت ئەوانی دوای بەکرستیانکردن هاتنە دنیاوە، ئەندەلووسیبوونی لێ دانەماڵین. هەموو ئەوەی ڕووی دا ناوی ناسنامەکە گۆڕا. عەرەبی تەواو نەبوون. ئیسپانیی تەواویش نەبوون. ئەوان ئەندەلووسی بوون. ئەندەلووسیبوون ناسنامەی سێیەمە. ناسنامەیەك ئینتیما بۆ خاك و ئینتیما بۆ بنەچەی دوور کۆی کردنەوە. هەروەها نێوان ناسنامەی کەشوهەوا و نەریت و ناسنامەی ئایینی کۆی کردنەوە. ئایا ئایینیش بەشێکە لە ناسنامە؟ ئایین، نەك بە مانا سرووتییەکەی، بەڵام لە قووڵاییە ڕۆشنبیرییەکەی. بیر لەوە دەکەمەوە ئیسپانەکان لە ڕۆژی دەرکردندا عەرەبیان دەرنەکرد، بەڵکوو ئیسپانیی وەکوو خۆیانیان دەرکرد. خۆیانیان دەرکرد. ئەندەلووسیبوون وەك هەر ناسنامەیەك

پێك هاتووه له زمان و ڕۆشنبیری و ڕه‌گوڕیشه. ئه‌نده‌لووسیبوون چه‌شنی جه‌واڵێکه بنه‌که‌ی ئایینی موسوڵمانان و زمانی ئیسپانی و تێکه‌ڵه‌یه‌ك له هه‌ردوو ڕۆشنبیرییه‌که. ڕه‌نگه ئه‌وانی به‌رایی عه‌ره‌ب، یان ئه‌مازیغی بووبن به ڕه‌چه‌ڵه‌کی ڕوون. به‌ڵام ڕه‌چه‌ڵه‌که ڕوونه‌کان، ئه‌گه‌ر ڕه‌چه‌ڵه‌کی پاك و ڕوون هه‌بێت، به تێپه‌ڕبوونی ساڵ و ده‌یه و سه‌ده‌کان نه‌مان. ده‌ستنووسه‌کان ئاماژه به ژن و ژنخوازی و توانه‌وه ده‌که‌ن. به موسوڵمانبوونی هه‌ندێك له کرستیانانی ئیسپانیا، جا ئیدی باوه‌ڕهێنان بێت، یاخود بۆ خۆدزینه‌وه بێت له سه‌رانه و باج. بیر له‌وه ده‌که‌مه‌وه ته‌نانه‌ت ئیسلامی ئه‌نده‌لووسییش خۆی ئیسلامی عه‌ره‌بی نه‌بووه له‌ژێر سایه‌ی ده‌وڵه‌تی ئه‌مه‌وی و عه‌باسی و ئه‌یوبی، هه‌روه‌ها ئیسلامی ده‌وڵه‌تی مه‌مالیك و ده‌وڵه‌تی عوسمانییش نه‌بووه. چی وامان لێ ده‌کات هه‌ست به ئینتیمابوون به دیاریکراوی بۆ ئه‌نده‌لووس بکه‌ین نه‌ك بۆ ده‌وڵه‌تی فاتیمی، بۆ نموونه؟ ژیانی ڕۆژانه به ڕۆشنبیرییه‌که‌یه‌وه له شوێنێکه‌وه بۆ شوێنێکی دی جیهانبینیی نوێ و جیاواز پێك ده‌هێنێت. ئیبن عه‌ره‌بی، ئیبن ڕوشد و ئیبن حه‌زم، وه‌کوو نموونه، ڕۆڵه‌ی تێکه‌ڵه‌ی ئه‌نده‌لووسی بوون. باوکم، وێڕای تێپه‌ڕینی ساڵانێکی زۆر به‌سه‌ر ڕاگواستنیدا، یه‌کێك له که‌سه دیاره‌کانی ئه‌نده‌لووس بوو. باوکم کوڕێکی دڵسۆزی ڕۆڵه‌یه‌کی عه‌ره‌ب بوو. ئه‌ی من؟! من کوڕی کێم؟!

له گه‌شته‌که‌مدا، له‌گه‌ڵ خۆمدا نامه سپییه‌که‌ی باوکمم هه‌ڵگرت. له‌به‌ر هه‌ر هۆیه‌ك بوو خستمه گیرفانمه‌وه، ڕه‌نگه وام زانیبێت ئه‌گه‌ر له شوێنێکی تردا بم، بتوانم بیخوێنمه‌وه. هه‌ندێك نامیلکه‌م بۆ نووسین هه‌ڵگرت، له‌وانه‌یه وه‌کوو کاغه‌زه‌کانی باپیرانم چه‌شنی قیبله‌نوما سوودیان لێ ببینم. وه‌کوو قیبله‌نومایه‌ك

بۆ کوڕەکانم. وەکوو غەریبەیەك سەرجەلەی خانەوادە و دەستنووسی نەخشەکەم هەڵگرتن. بێگومان کلیلەکانیماڵیش.

هەرچی دەستنووسەکانی تر بوون، کە لەبەریانم نووسینەوە و ئەوانیشی لەبەریانم نەنووسینەوە، لە حەوشەی ماڵەکەماندا وەکوو بەڵێنێکی دواخراو بە گەڕانەوە، مانەوە. بەڵێنێك چەشنی بەڵێنی دواخراو بە گەڕانەوە بۆ کوینکا.

# 50

له مه‌درید، هه‌ستم به هۆگرییه‌ك كرد جیا له هۆگریی شاره‌كه‌م. مه‌درید له من ده‌چێت. مه‌درید هاونه‌واتره له‌گه‌ڵ پشێوی و سه‌رلێشێوانه‌كه‌م. ڕیتمی خێرا، به به‌راورد به ڕیتمی مردووی شاره‌كه‌م. له‌گه‌ڵ ئه‌و شڵه‌ژانه‌ی به تێپه‌ڕبوونی كات له ناخمدا زیاد ده‌كات، وه‌كوو چه‌رخێك نه‌وه‌ستێت، وه‌كوو لۆقه‌ی ئه‌سپێك ڕێگه ون بكات.

له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌شدا، مه‌درید شاری به‌ڵێنه ساخته‌كانه. شاری سه‌رابه‌كانه. مه‌درید له قووڵاییدا، له له‌شفرۆشانی جاده‌ی "مۆنتێرا" ده‌چێت. سۆزانیگه‌لێك به‌ڵێنی پێشكه‌شكردنی هه‌موو شتێكت ده‌ده‌نێ، كه‌چی له دواییدا ته‌نیا نائومێدیت پێ ده‌به‌خشن. مه‌درید نابه‌خشێت. ته‌نیا هێنده‌ی شاره‌زات بێت ده‌تداتێ. هیچ به غه‌ریبه نابه‌خشێت. هاودژیی ته‌لارسازیی شاره‌كه له‌گه‌ڵ ده‌رۆزه‌كه‌راندا له گۆشه‌یه‌كدا له پێكدژیی جوانیی سۆزانییان ده‌چێت به سكی به‌تاڵیانه‌وه. مه‌درید له ئامێزت ناگرێت، به‌ڵام له هه‌وادا ماچت تێ ده‌گرێت. له هه‌وادا له‌گه‌ڵ

ماچی هەڵپەسێرراودا تۆش بە هەڵپەسێرراوی دەمێنیتەوە. دڵت لایەتی. ئەو شارە پێچەوانەی شارانی دی دەتوانێت ڕۆحت تێوە بگلێنێت، لەناویدا هەست بە چۆلەوانی و لە دەرەوەیشدا هەست بە ونبوون دەکەیت. مەدرید، پێچەوانەی شارەکەی من، هیوا و ئومێدت پێ دەبەخشێت. شارەکەی من، پێچەوانەی مەدرید، ڕووبەڕووی ڕاستیی ڕووتت دەکاتەوە. ڕووت دوور لە ساختە. ڕووت بێ جوانکاری. شارەکەم نائومێدە. شارێکە لە پیرەژنێك دەچێت سوورە لەسەر ئەوەی پیریتییەکەی نەشاریتەوە. هەر لە یەکەمین ساتەوە ئازاری ئێسکەکانیت بۆ ئاشکرا دەکات. مەدرید، لە بەرابەردا، پیرەژنێکی منداڵڕەفتارە. هەردەم ناچار بوو ئەندامێکی لەکارکەوتووی لێ دەکاتەوە. لەبری ئەوە ئەندامی تەواورێك بەکار دەبات. ئەندامی دروستکراو بەکار دەهێنێت غەریبە نازانێت دەستکردە. وێڕای جیاوازییە گەورەکانی نێوان ئەو دوو شارە، ئینجاش ژیان و مردن بە ڕوونی بە هەر یەکێکیانەوە دەلکێن: شارەکەم شاری مەرگە، مەدریدیش شاری ژیانە. بە ڕۆژ ژیان لە مەدرید دادەمەزرێت، بە شەویش ژیان وەکوو شێت بە گوڕ دەبێت. بە ڕۆژ مەرگ شارەکەم دەگرێتەوە، بە شەویش مەرگ هەڵدەمژێت. ئەو شەقامانەی سەر "لا بویرتا دل سۆل" سیی هەڵقوولاون بە سەرمەستی. شەقامەکانی چەقی شارەکەم ڕێگەی خوێنڕێژ کراون.

شاری گۆڕستانەکانی نزیك ماڵەکەمان، دەکەوێتە

ناوجەرگەی شارەوە. ناوجەرگەی شار مەرگ و تەرمە. جەستەی بێرۆحە. ڕۆحەیلی بێ جەستەن. گۆڕستانەکانی مەدرید لە کەناری شارن، بەڵام ناوجەرگەی شار ژیانێکە دزە دەکاتە جەستە حەساوەکانەوە.

# 51

Musica Andalusi

**دەقی گۆرانییەکە لە یوتیوب:**

| | |
|---|---|
| لجـــة عظيمـــة ســـاحلها | مـن بـديع المرمـر المنتخـب |
| ماؤهـا كـذوب در سـال فـي | بــرد اعظمـــه مــن العجـــب |
| شف عنـي المـاء حتـى اننـي | لست حينا عنك بالمحتجب |
| فكـــاني والـــذي حويتـــه | من معين الماء في المنسكب |
| قطعة من بـرد فبعضـها ذائـب | وبعضـــــها لـــــم يـــــذب |
| واذا طفـا الحبـاب خلتنـــي | فلكـا اطلـع شـتى الشـهب |
| فكـان الجهـر منـي صـدف | جـامع جـوهر ذاك الحبـب |
| حـادثتني السـعود اعصـرا | للهمـــام الغـــالبي النســـب |
| مـن بنـي الاقيـال مـن اليمن | غرر الفضـل ومغنـى الحسـب |
| من بنـي قيلـة مـن خـزرجهم | مظهـرو الحـق وانصـار النبـي. |

**(ئیبن زومروك)**

# 53

## کاغەزەکانی ئایشە دی مۆلینا

## کوینکا/ ١٥٧١

### (6)

وەکوو چاوەڕوانکراو بوو، هەواڵەکەمان لەسەر گۆمێك لە خوێن پێگەیشت. هێندە خوێن گەر چاوانیشمان بنووقێنین، بە بۆن دەیناسینەوە. هێندە خوێنی زۆر، دەمانزانی خوێنی خۆمانە. ساڵانێکە ئەو خوێنە وەکوو دەریا دەڕژێت. شۆڕش هەڵگیرسا، تاکوو ئەو خوێن لەبەر ڕۆیشتنە بوەستێنیت. بەڵام خوێن لەبەر ڕۆیشتنەکە، وای لە ئازاری من، زیاد دەکات و چەند قات دەبێت. غەرناتە، غەرناتەکەمان، خوێنی لەبەر دەڕوات. ئێمەش لێرە، لەبەر خوێن لەبەر ڕۆیشتنەکەی خوێنمان لێ دەچۆڕێت. ئێمە لێرە بە هۆی خوێن لەبەرڕۆیشتنەکەی، خوێنمان لەبەر دەڕوات. فلیپی دووەم، بە دەستی خوێناوییەوە، فەرمان بە خوێنی پتر دەردەکات. سەیرە! بە بەکرستیانکردنی کەسوکارمان واز ناهێنێت. مایەی سەیرە! بە سەرکوتکردنیان دەست هەڵناگرێت. بە دڵڕەقی و دادگەکانی پشکنین وازی نەهێنا! سەرلەنوێ فەرمانی پاشایە! بە قەدەغەکردنی هەر دیاردەیەکی ڕۆشنبیریمان. لە نێو ئەوانەی قەدەغەی کردوون، سەمای تامبرایە. هەروەها ئاهەنگی

سبووع[1] و ناشتنی مردوو لەسەر ڕێبازی خۆمان. بە گشتی ناهێڵن کرستیانانی نوێ هەناسە بکێشن. پاشایش چاوەڕێیە هەمووان ملکەچ بن. بەڵام هەمووان چەندێك بەرگە بگرن، هەڵدەگەڕێنەوە و یاخی دەبن. ناکرێت، بگرە ئەستەمە دابونەریتی ڕیشەداکوتراوی خەڵك بسڕنەوە. ئایا دەکرێت بە زۆر ئایین بگۆڕرێت؟ ئایا دەکرێت نەریتی بۆماوە بگۆڕرێت؟ بە فەرمانی پاشا، وەکوو دەبینین، خانەی بەکرستیانبوون جێ دەهێڵین بۆ خانەی سەرشۆڕی. بۆ خانەی دەرکردنی ڕووپۆشراو، بۆ خانەی ڕق. ئەوە ساڵێکە، پتر لە ساڵێکە، شۆڕش بەردەوامە. ساڵێکە، بۆ ساڵانی داهاتووش، یاخیبوون بەردەوام دەبێت. گوندی ئەلبوشاراتی مەڵبەندی یاخیبوونیان گەمارۆ داوە، دەکوژن و دەبڕن. چاوەڕوانن، بە لووتبەرزییەوە چاوەڕوانی لەناودانی یاخیبووانن. دەسووتێنن، نەك تەنیا ماڵ و زەوی، بگرە ڕۆح و جەستەکانیش. جەستە سووتاوەکانیش، وەکوو کاردانەوەیەك، کڵێسا و قەشەکان ئاگر تێ بەردەدەن. قەشەکان، گوایا ڕاستی لای ئەوانە، دەکوژن. قەشەکان، بە مەبەستی پاکتاوی ڕۆحی موسوڵمانان، هانی سووتان دەدەن. هۆکارەکەی چییە، ئەگەر هۆیەك هەبێت بۆ کوشتن بە ناوی خواوە؟ بە ناوی پەروەردگارەوە، یاخود پاشا، یان بە ناوی زەوی و ماڵەوە؟ یاخود بە ناوی ڕقەوە؟ ئاخۆ بۆچی دەتەوێت لە تۆ بچم بۆ ئەوەی قبووڵم بکەیت؟ بۆچی خۆت بە ڕێنماییکردنمەوە خەریك دەکەیت؟ بە بردنم بۆ بەهەشت؟ بە پاقژکردنەوەی ڕۆحم؟ لێبوردەیی ئەوە نییە لە یەکدی بچین، بەڵکوو بە جیاوازیمانەوە یەکتر قبووڵ بکەین.

---

[1] **ئاهەنگی سبووع:** کاتێك خێزانێك منداڵیان دەبێت، بەو بۆنەیەوە دوای هەفتەیەك دەیخەنە بێژنگەوە و دایکە حەوت جاران بەسەریدا باز دەدات. (وەرگێڕ)

# 54

## له نووسراوه‌كانی كارلۆس مه‌روانی كوڕی مه‌ریه‌می كیژی عه‌بدوللا دی مۆلینا
## (كارلۆس دی مۆلینا)

### (1)

ئامۆزایه‌ل له قه‌لای خۆلین

سلاوی خۆشه‌ویستی

تاجی كاسۆلیكی وا ده‌زانێت به‌سه‌ر مۆریسكییاندا سه‌ركه‌وتووه. ئه‌و، وا ده‌زانێت به سووتاندنیان و گڕبه‌ردانی له ماڵ و به‌روبووم و ئه‌شكه‌وته‌كانیان، سه‌ركه‌وتووه. تاجی كاسۆلیكی نازانێت، یاخود ڕه‌نگه بزانێت، هه‌ندێك له سه‌ركه‌وتنه‌كان شكستن. گه‌وره‌ترین شكستیش سه‌ركه‌وتنه به‌سه‌ر چه‌وساواندا. بۆ ئه‌وه‌ی كاره‌ساته‌كه به‌ركه‌ماڵ بێت، چونكه ده‌بێت به‌ركه‌ماڵ بێت، گوێت له پاساوهێنانه‌وه ده‌بێت.

پاساوی: مۆریسكییان له‌گه‌ڵ فه‌ڕه‌نسییاندا بۆ ڕووخاندنی ده‌وله‌تی ئیسپان هاوكارن.

پاساوی: دەوڵەتی عوسمانی بە پشتیوانیی ناوخۆ، ئەویش مۆریسکییەکانن، لە تەقەلادایە ئیسپانیا داگیر بکات.

پاساوی: مۆریسکییەکان کرستیانی نوێ نین، ئەوان خەریکی ئایینی کۆنی خۆیانن و بە دزییەوە پێڕەوی دەکەن.

پاساوی: دەبێت ڕۆحە سەرلێشێواوەکانیان پاك بکەینەوە.

پاساوی: یەکێتیی خاکی ئیسپان نایەتە دی، مادامەکی موسوڵمان هەن چەشنی دڕك لە پشتەوە وێستاون.

ئێمە دەزانین، وەکوو ئێوەش دەزانن پسمامان، ئەوە ململانێی ئایین نییە. دەزانین، وەکوو خۆتانیش پێ دەزانن، ئەوە دەسەڵاتی پاشایە دەسەڵاتی ئایین دەجووڵێنێت. ئایین بەکار دەهێنرێت بۆ سازدانی کلۆڵان و هەژاران دژ بە کلۆڵان و هەژاران. پاشا بۆ سەرکەوتنێکی درۆیینە دەکۆشێت. لەژێر تاجی کاسۆلیکدا تاجی چاوتێبڕین هەیە لە زەوی و ماڵ و بەروبوومەکانمان.

یەکبن و ئارامتان هەبێت. پشت بە خوا ببەستن. پەژارە نامێنێت، چونکە دەبێت نەمێنێت.

**براتان: کارلۆس**

**کوینکا/ ١٥٧٤**

# 56

## له كاغەزەكانی دییگۆ فرناندێسی كوڕی فاتیمەی كچی یونس دی مۆلینا

## (دییگۆ یونس دی مۆلینا)

### (1)

خانەوادە بە نرخەكەم لە كوینكا

سالانی ڕابردوو بێ هەواڵ بووین لەیەكتر، هەڵبەت بە خۆتان دەزانن لەبەر هەندێك هۆكار لە دەرەوەی دەسەڵاتمانە. لەبەر هەمان ڕەوش بە بێدەنگیی نامەكان دەگەیشتن. نەماندەویست نامەگەلی پڕ لە خەم و كەسەرتان بۆ بنێرین، بە ڕاستی خەمەكان لەوە گەورەتر بوون مەرەكەبی ئێمە بیاننووسێتەوە.

خێزانە شرینەكەم

لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەلبوشاراتدا، بە برینداریی لە قەلای خۆلین دەرچووین، تاكوو لە غەرناتە پشتیوانیی كەسوكارمان بكەین. ئەوان، وەكوو ئێمە بەدەست گاڵتەپێكردن و سووك تەماشاكردنەوە دەیانناڵاند. هەموو شتێكمان لێ قەدەغە

کرابوو، ئەوانیش لە هەموو شت بێبەری بوون. دەبوو بەپێی فەرمانی شاهانە بخۆین و بپۆشین و قسان بکەین و بیر بکەینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا گوێڕایەڵ بووین. کەچی ئینجاش هەر مایەی گومان بووین.

دەبوو شۆڕش هەر ڕووی بدایا، ئیدی کێ بەرگەی سووکایەتی دەگرێت؟ کێ بەرگەی ڕێکردن دەگرێت بەسەری شۆڕەوە؟ براینە، باسی ناخۆشیی بەزۆر گۆڕینی ئایین بە ئایینتان بۆ ناکەم، وەکوو چۆن لەگەڵ باوکانماندا کرا، لەوە ناخۆشتر ئەوەیە وەکوو خۆفرۆش لێت بڕوانێت، چونکە بنەچەت عەرەبە. گومان لە خۆشەویستی و دڵسۆزی و ئەمەکت بۆ ئەو خاکەت بکەن، کە لێی لەدایك بوویت. ئێمە لێرە و ئێوەش لەوێ وەك ئاسکەی سەرلێشێواوی ناو دارستانمان لێ هات. گەلەئاسکێك ئەگەر لە دەستی شێر ڕزگار بن، ئەوا لە چنگی پڵینگان قوتاریان نابێت.

ڕەنگە هەواڵەکانی سووتاندنی کەسوکارمانتان لە سەروەختی شۆڕشدا بیستبێت. لەوانەیە هەواڵی دڕندانەی تاجی کاسۆلیکیتان پێ گەیشتبێت. لێ ئەوی دڵ بۆی خوێنی لێ دەچۆڕێت بۆتانی دەگێڕمەوە.

ئەوەندەی توانییان پیاویان کوشت، سەربازانی کاسۆلیك منداڵەکانمانیان ڕفاند. هەموو ئەو منداڵانەی بە دیل گیران ڕفاندیانن، پاشان گواستیاننەوە بۆ ئەو شارانەی لەژێر دەسەڵاتی خۆیان بوون، وەکوو تولەیتولە، دوور نییە هەندێکیانیان بۆ کوینکا ڕەوانە کردبێت. پلانەکە وەکوو زانیمان و بڵاو بووەوە، ئەوە بوو لەژێر باڵی ڕۆشنبیری و خانەوادە کاسۆلیکییەکاندا پەروەردە بین، بۆ ئەوەی ڕۆڵەکانمان لەسەر ڕێبازی ئەوان

کاسۆلیك بن. ئەوان هەردەم متمانەیان بە کاسۆلیکبوونمان نەبوو، وێڕای ئەوەی لە کڵێساکانیان ئاوەمۆرمان کرد و باربوومان بۆ قەشەکانیان کۆ کردەوە، ڕۆژێك چییە لە نوێژی یەکشەممە و ئاهەنگەکانی هەفتەی ئازارەکان دانەبڕاین. بە خۆتان دەزانن، هەرگیز بنەچەی ئیسلامیی ئێمەیان لەبیر نەکرد. بەڵام وەکوو دەزانن، دەستی باپیرانمانیان لە بیر کرد زەوییان چاند و کۆشکیان بنیات نا.

ئەی ئامۆزاکانم، ئێستا منداڵەکانمان، لە شارەیلێکی تر بڵاو بوونەتەوە نایانناسین. خوێنی ئێمە بە دەمارەکانیاندا دێت و دەچێت و سیمامان بە ڕوخساریانەوەیە. مێژووی ئێمەیان هەڵگرتووە. مێژووی تواوەمان. مێژووی ئەندەلووسیمان. تاقە دڵنەواییمان، چونکە ئێمە لە دڵنەوایی دەگەڕێین، بەوە منداڵەکانمان لە ئاسوودەییدا دەژین. دڵنەواییەکی تر هەیە بە دووری دەزانم: بە بڵاوبوونەوەی منداڵەکانمان لە شارەکانی تردا بۆ هەمیشە لێرە دەمێنینەوە. پسمامە شیرنەکانم، بیرتان نەچێ، ئەو هەڕەشەی دەرکردنانەی بەدوامانەوەن، ئەگەر ڕوو بدەن و بێگومان ڕوو دەدەن، تۆوێکی هەتاهەتاییمان لە خاکی خۆماندا دەبێت. تۆوێك، تەنانەت بێ دەرککردن، لەوێ نەبوونمان بۆ دەگەڕێنێتەوە. تۆوێك، گەشە دەکات و ئاماژە بە هەموو ئەوانە دەکات بە خۆشەویستی لێرە بنیاتمان نا. هەرچەندە چارەنووسمان وابوو زەوییەکانمان جێ بهێڵین، سەرەڕای ناخۆشیی ئەوە، ڕەنگە ئەوە باشتر بێت بۆ منداڵەکانمان، یادگەمان لێرە بێت. دەنگی کپکراوی بڵندبوومان. دڵنەواییەکی تریش هەیە، ئێستا بە مێشکمدا هات، هەیانە وەکوو چۆن ئێستا بۆتان دەنووسم، ئاوا بە

ناعەرەبی دەنووسێت، ڕۆژێك دێت نامەمان بۆ دەنێرن. بە هیوام نامە بنێرن.

بە تەواوبوونی شەڕی شکستخواردووان، ئەوی هەڵهات هەڵهات، ئەویشی خۆی شاردەوە خۆی شاردەوە، جارێکی دی گەڕاینەوە قەلای خۆلین، لەو جێیەی ئێستا لێوەی بۆتان دەنووسم. گەڕاینەوە سەر زەوییەکانمان تۆویان بکەین.

قەلای خۆلین، وەکوو خۆتان دەزانن، وێڕای ئەوەی گوندێکی بچووکە، بەلام لەم جیهانە تەنگە بەرفرەوانترە. ڕاستییەکەی پیاوانی دەسەلات هەراسانیان کردووین، کەچی خەلکەکە جیاوازی ناکەن لە نێوان مۆریسکی و کرستیانێکی نوێ، یاخود کرستیانێکی کۆندا. خۆشەویستانم، خەلکی ئاوایی لێبوردەترن لە ڕۆلەکانی شار. خۆڕسکیی پاکترە لە ئارەزووی یەکێتیی ساختە.

بە خواتان دەسپێرم، خوا ئاگەدارتان بێت...

**دیبگۆ**

**قەلای خۆلین/ ١٥٧٩**

## 57

"هەر هێندەی لە نانخواردن دەبێتەوە دەڵێت: ئەلحەمدولیللا. هەندێك لە دراوسێكان داوەتیان دەكرد و هێلكە بە ڕۆنی بەرازیان دەدایێ بێ ئەوەی پێی بێژن. هەر كە پێی دەزانی دەڕشایەوە، چون ڕیخۆڵەی هەڵبهێنێتەوە".

"هەر كات بیانبینیایا دراوسێیەك شووشە شەرابی پێیە، هاواریان دەكرد: تۆبە خودایە، پێی ئەوانە بە بڕین بچێت دروستیان كردووە، ئاخر ئەمە پەروەردگار تووڕە دەكات".

**لە كاغەزەكانی دادگەكانی پشكنین، ئەمانە دەرگیری بوون:**

خوان گراندی، مۆریسكییەكی خەڵكی "ئاركۆس دی خالۆن"ە، چونكە ڕەتیكردەوە گۆشتی بەراز بخوات و شەراب بخواتەوە، ساڵی ١٥٦٩.

## 58

ڕێگەی نێوان مەدرید و کوینکا دوو سەعاتی خایاند. لەو نێوەدا تەنیا بیرم لە دایکم دەکردەوە. دایکم لە کوینکا، یاخود لە قەڵای خۆڵینە، باوکم وای گوت، ئەگەر بیرم نەچووبێتەوە. پاشان گومانم لەوە کرد لە کوینکا بووبێت. ئەو هۆکارە چییە وا لە دایکم دەکات لە کوینکادا بژی؟! دەزانم پێدراوەکانم هەڵەن و چاوەڕێکردنی لەوێ تەنیا ئارەزووە. دایکم، وا هەست دەکەم، لە قەڵای خۆڵینە. دایکم، سەرەڕای ئەو شتانەی بە کوینکاوەی دەبەستن، بە تەنیا لە شارۆچکەکەدا نامێنێتەوە لەسەر داروپەردوو بگری. بگری، یاخود ئەو شتانە بپارێزێت پێویستە بیاندۆزمەوە.

لە ڕێگە، یادی باوکم لە دوارۆژەکانیدا لێم جیا نەدەبووەوە. هەموو نیگاکانی دەلالەتی وایان هەڵگرتبوو، تاکوو ئێستاش بە تەواوی نەمدۆزیونەتەوە. گشت قسەکانی ڕێنیشاندەر بوون، بەڵام وەکوو دەستەواژەی سۆفیگەران، ناڕوون بوون و ئەستەم بوون لێکدانەوەیان بۆ بکرێت. تێنەگەیشتم، بۆ نموونە، چۆن باوکم بە خۆی لە دەستنووسەکانی کوینکا نەگەڕاوە. زۆر باوەڕ ناکەم تەنیا بە دەستنووسەکانی جادووگەران وازی هێنابێت، بۆ ئەوەی ئاگەداری مێژووی باپیرانمان بێت. ئایا لاپرەسەنی دنەی نەداوە تەماشای ئەو سەرزەوییە بکات لێوەی هاتوون؟ ئایا لەبەر ئەوە باوکم دایکمی خواستووە، چونکە سەرسام بووە بە ئافرەتی

ئەوروپی، یاخۆ ئەوی براوە بیگەیەنێتەوە یەك؟ ئاخۆ دایکم حەزی بە ڕابردووی باوکم کردووە یاخود ئێستای؟! ئەی من، چۆن لە باوەشی دایکم نەمامەوە و چووم لەگەڵ باوکمدا مامەوە؟!

لە ڕێگە بەرەو کوینکا، وەکوو تینوویەك لە بیاباندا خەونە کۆنەکانی خۆمم لە شاردا بیر هاتنەوە. وەك ئەوەی خەونەکان ڕێگە بن بۆ گەیشتن. چون ڕۆح لە ئاوەز پتر بزانێت. وەك ئەوەی نەست یادەوەریی باوباپیران کۆ بکاتەوە. چون خڕیی زەوی نەك هەر تەنیا تیۆرێکی فیزیایی بێت، بەڵکوو تیۆرێکی ڕۆحییش بێت.

# 59

من و کوینکا دوو لایەنی پێکدژین. بەڵام ڕەنگە هاوسەنگیی ڕۆح لێرەدا سەقامگیر بێت. وەك چۆن ڕۆحی باوباپیرانم سەقامگیر بوون. من ئەمەم لە ساتی یەکەمەوە زانی، کە لە شارە دێرینەکە نزیك بوومەوە. نەخشە بەدەستمەوە و کلیل لە جانتاکەم، گەیشتمە ماڵی عەبدوڵڵا دی مۆلینا، ژمارە ٩٧.

بە شەقامە تەنگ و بەرزەکاندا ڕێم کرد، ئەملا و ئەولایان ماڵی کۆنی دوو نهۆمی، یاخود زیاتر سێ نهۆمی بوون. بانیژەی ماڵەکان هێند نزیك بوون، وام هاتە بەرچاو دەستم دەیانگاتێ. وەك بەڵگەیەکی تری دێرینییان بەردی خانووەکان دەرپەڕیبوونە دەرەوە. وەك ملی ئەسپ دەرپەڕیبوون. ئەو ئەسپانەی سوارەکانیان بە ملپەڕیوی بینی.

بە کلیلەکانی دەستمەوە لە بەردەم دەرگەیەکی سەدەکانی ناوەڕاست وێستام. تاك دەرگەیەکی کەوانەیی دارین. کۆن و درزتێکەوتوو، وەك مێژووی باوباپیرانم. چەشنی دەستنووس و ڕۆژنامەکانیان. وەکوو زامی دەم کراوەیان. کلیلە ئاسنە گەورەکە نەك هەر لەگەڵ قەبارەی دەرگەکە گونجاو بوو، بەڵکوو لەگەڵ مێژووەکەشی. دەرگەکە، ئاوا دەرکم کرد، دەروازەیەکی نوێیە بە ڕووی جیهانێکی تردا. لە بەردەم دەرگەکەدا خەونێکی کۆنم بیر هاتەوە، لە خەونمدا برادەرێکی مردووم هات بۆ لام، لە ماڵ

دەریکردم و بەرەو ڕێگەیەکی بردم شارەزای نەبووم. بەردەوام ڕامان دەکرد بێ ئەوەی بزانم بۆ کوێ دەڕۆین. لە پێش دەرگەیەك وێستاین لە دەروازەی شارە کۆنەکانی دەکرد. لەوێ لە شوێن خۆم مەییم. هەردووکمان نزیکەی سێزدە ساڵی بووین، هاوەڵەکەم، کلیلێکی دەرهێنا و دەرگەکەی کردەوە. من لە پشتەوە هەستم بە ترس دەکرد. کاتێك ئاستانەی دەرگەکەمان بڕی و لە کاتێکدا چاوەڕوانی زەوییەکی ئاوەدان بووم، خۆم لە بیاباندا بینییەوە. بیابان، بەپێی لێکدانەوەی خۆم لەو کاتەدا ملنان بوو بەرەو مردن.

لەبەردەم دەرگەکەدا، باوکم لەسەر شانمەوە پاڵی دەنام ئاودیو بم، بینیم دەرگەکە بە هێوری دەکرێتەوە. خانمێك بە قژە قاوەیی و چاوە خڕەکانییەوە تەماشای دەکردم. ئەو خاتوونە بەوپێیەی لەو ساتەدا سەرنجم دا لە من دەچوو. ئەو خانمە، وەکوو لەو چرکەساتەدا دەرکم کرد، دایکم بوو.

# 60

"یەك ڕۆژێك لێرە لەگەڵتدا دەمێنمەوە، بۆ سەرلەبەیانی بۆ قەڵای خۆڵین دەڕۆم"، دایکم بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە گوتی. وای گوت و چاوەڕوان بوو پێی بڵێم دواتر دێم. کاتێك نەمگوت، ئەو بە ئاوازێکی فەرمانئامێزەوە بۆ ئەوەی توندیەکەی سووك بکات، گوتی: "هەر کات ویستت".

دایکم بەناو ماڵەکەدا گڕی دام. لەگەڵمدا بە نەردەوانە بەردییەکەدا بەرەو ئەو ژێرزەمینانە دابەزی، وەکوو من بزانم بەژێر حەوت ماڵدا درێژ دەبنەوە. لەوێ لەژێر زەوی، ڕووناکی باش بوو، هەواگۆڕینیش حەسێنەرەوە بوو. دایکم، ئاوای بۆ گێڕامەوە، لەزگەی بچووك بچووکی بەسەر هەر سندووقێکەوە دانا. ئەو لەزگانە نیشانەی ناواخنی سندووقەکان بوون. گوتی ساڵانێکی زۆر بۆ ئاسانکردنی خوێندنەوەیان، هەموو ئەم دەستنووسانەی بە درۆ خستنەوە، کەچی چاوەڕوانی هاتنی کردم بۆ ڕاوێژپێکردنم لە پاراستنیان، یاخود دەستلێهەڵگرتنیان.

دایکم دەستنووسەکانی بەپێی مێژووەکانیان جیا کردنەوە، بۆیە دەستنووسەکانی سەدەی سێزدە و چواردەی لە سندووقی نزیك یەکدی دانا، ئەوانی سەدەی پانزە و شانزەشی لە گۆشەیەکی ترەوە دانان. گرێبەستی مولکداری، هاوسەرگیری،

جیابوونەوە، بەڵگەنامەی لەدایکبوون و مردنی تایبەت بە هەر سەدەیەکی نزیك یەکدی دانان، پاشان یادگاریی ڕۆژانە و یادەوەری و ساڵانە و نامەکانی لە سندووقی تردا تەقەت کردن. دایکم گوتی، پۆلێنکردنەکە پتر لە بیست ساڵی خایاندووە، چاوم بە هەموو بەڵگەنامەکاندا خشاند و فێر بووم بۆ پاراستنیان چۆن کەشی گونجاویان بۆ بڕەخسێنم. لە کاتی گەڕاندا بە زانخوازییەوە، تێبینیم کرد دەستنووسەکان بە عەرەبی و ئیسپانیی کۆن و ناعەرەبی نووسراون. وێڕای ڕوونیی خەتەکە و وردبینیی پیتەکان، کەچی خوێندنەوەی دەستنووسێك، ناڵێم لەبەرگرتنەوەی، یاخود وەرگێڕانی، کارێکی سەخت بوو. کاتێك وەسیەتەکەی باوکمم بە دایکم ڕاگەیاند، بە بەزەییانەوە لێی ڕوانیم.

لە بەردەم بێهیواییەکەمدا، دایکم پێی لەسەر هیچ شتێك دانەگرت. تەنیا ڕێنمایی دەکردم و بەس. لەبەر سەرسوڕمانە هاوکات بە نائومێدییەکەم، ئاسان نەبوو بڕیار بدەم. لەگەڵ ئەوەشدا جارێکی دی ئاماژەم بۆ کرد، بۆ ئارەزووی باوکم بۆ لەبەرگرتنەوەی ئەوی بکرێت لەبەری بگیرێتەوە و ئەسڵییەکان بپارێزرێن. دایکم باگۆی نەداوە، کاتێك پشتی تێ کردم تێبینیی کۆمییەکەیم کرد. بینیم چۆن ڕۆژگار تێپەڕی و پشتی چەماندەوە. بیرم لەوە کردەوە پشتکووڕییەکەی دایکمم بە میراتی بۆ دەمێنێتەوە، وەکوو چۆن باپیرانم ملگێڕییان بۆ مایەوە.

## 61

دایکم بۆی گێڕامەوە، بۆ من چاوەڕواننەکراو بوو، من لە قەڵای خۆڵین لەدایك بوومە. گوتی، باوکم قەڵاندۆشکانی پێ کردووم و بەناو گونددا گڕی داوم، تەنانەت ئێستاش خەڵکەکەی منیان لە بیرە. لە قەڵای خۆڵین چاوم کرایەوە، یەکەم شت بینیم کێڵگە زەیتوونە هەمیشە درێژبووەوەکان بوو لەو سەرزەوییەدا.

دایکم گێڕایەوە، پێگرتنم لەوێ بوو. گەمە و لاسارییەکانی بەراییم لە شەقامە تەنگەکاندا بوو، بە خانووە بەردینەکانییەوە. بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە گوتی "لە کوێ دەستمان پێ کرد لەوێ تەواو دەبین". دایکم بە تەمەن نەبوو، بەڵام پێویستی بە شتێك بوو قورسایی خۆی بداتە بانیدا، ئەوە بوو گۆچانی بەکار هێنا. چاوە خڕە فستقییەکانی هێشتانەکینێترووسکەی خۆیان پاراستبوو. ترووسکەیەك لەگەڵ کۆمییەکەیدا نەدەهاتەوە. درەوشانەوەیەك هەرگیز نەمزانی ئاخۆ درەوشانەوەی کونجکۆڵییە، یاخۆ خۆشیی بینینی من.

کەواتە، یادەوەرییەکانم لەگەڵ دایکمدا لەو شارە نەبوون لێوەی هاتم. دانیشتنم لە چاوەڕوانیی ئەودا، تەنیا یادێکی درۆینە

بوو باوکم دزەی پێ کرد. دایکم گوتی: "تەمەنت سێ ساڵان بوو گواستمانەوە بۆ کوینکا، لە گۆڕستانەکانی "سان ئیسیدرۆ" چەپکە گوڵمان لەسەر گۆڕی باپیرانمان دانا". کەواتە سووڕانەوەم لەگەڵ باوکم بە شەقامە بڵندەکانی کوینکادا و دانیشتنم لەسەر ئەو بەرزاییانەی دەیانڕوانییە سەر دوو زێی بچووك، خەون نەبوو. بینینی خانووە داتاشراوەکان لە بەرد خەون نەبوو. ڕەنگە خەون نابێت، ئەگەر باوکم لەوێ لەو گردەی دەڕوانێتە سەر شارە دێرینەکە، ماڵئاواییم لێ بکات.

## 62

"کرستیانان بە ڕۆنی بەراز نەبێت ناتوانن خواردن لێبنێن، لە خاکی ئەویشدا (غەرناتە) بە ڕۆن خواردن لێدەنێن".

"لەبەر ئەوەی چاوی لە ئازادییە بۆ ئەوەی بەپێی ئەم بیروباوەڕە بژی، دەیگوت، تورکان بەڕێوەن، داوای لە پەروەردگار دەکرد بێن و گشت مۆریسکییان ڕزگار بکەن، هەروەها سکاڵای بۆ تورکان دەکرد بەوەی لەم خاکە مامەڵەی خراپیان لەگەڵدا دەکەین. ئەو خانمە نوێژی دەکرد بێن و لەگەڵیاندا بڕۆن، تاکوو بە ئازادی بژی و بە ئاشکرا لە پێڕەوکردنی بیروباوەڕی بەردەوام بێت. هەروەها دەیگوت، لە گشت مەملەکەتەکاندا ئەوان ڕێگە بە هەمووان دەدەن بەو بیروباوەڕەوە بژین خۆیان دەیانەوێت، ئەی بۆ لەم مەملەکەتە ڕێگەیان نادەینێ بە بیروباوەڕی خۆیانەوە بژین؟!"

**لە کاغەزەکانی دادگەی پشکنینی ماریا دی مندۆسای مۆریسکیی غەرناتەیی، ساڵی ١٥٧٢**

## 63

- بەڵام ئەی خاوەنشکۆ، ئەگەر بفەرمووی ڕێگەم بدەی قسەیەك بکەم...

- قسە بکە!

- چ پێویست دەکات سەرپشکیان بکەیت لە نێوان ڕاگوێزان و گۆڕینی ئایینیان ئەگەر بەڵێنمان بە ئەبوعەبدوڵلا بە مانەوە و ئازادیی بیروباوەڕ دابێت، هەر کات کلیلی غەرناتەمان بداتە دەستەوە؟ موسوڵمانان چ مەترسییەکیان بۆ سەر تاجی پاشایی، یاخود یەکێتیی وڵاتەکەمان دەبێت؟

- مەترسییەکە لەوەدا نییە ئایینێکی تریان هەیە، بگرە لەبەر ئەوەیە دڵسۆزییان بۆ ئایینەکەیان ڕەنگە وایان لێ بکات دڵسۆزییان بۆ عەرەب، برا ئایینییەکانیان لە بەری ئەوبەرەوە هەبێت.

- بەڵام جەنابی خاوەنشکۆ، ئەوان وەفادارن بۆ ئەو خاکەی لەسەری لەدایکبوون و لەو زیاتر ناناسن. ئەوان ڕێك وەك ئێمەن، لە ئاوی ڕووبارمانیان خواردەوە و لە بەروبوومی خاکەکەمانیان خوارد. ژنیان لێ خواستین و منداڵیان بوو، تاکوو وای لێ هات ئەستەمە خوێن جیا بکەینەوە. لە بەهێزییاندا ناچاریان نەکردین

بچینە سەر ئایینیان، لە سالآنی شکستیشیاندا وەکوو مودخار لە مەملەکەتەکانی کاسۆلیك لە نێوماندا ژیان، ئێمە تەنیا چاکەمان لێ بینین. پاشان خاوەنشکۆ، تۆ بە خۆت دادپەروەریت و دادپەروەریی سیفەتتە، ئایا بە ڕەوای دەزانیت سزای قەومێك بدەین بە تاوانێك هێشتا نەیانکردووە، تەنیا لەبەر ئەوەی وای بۆ دەچین دەیکەن؟!

- لە سیاسەتدا، تۆ تەماشای ئەو تەرمانە ناکەیت پێیان بەسەردا دەنێیت، بەڵکوو لەو هێڵە دەڕوانیت گرەو دەکەیت لەسەر گەیشتن پێی. لە ڕێگەی گەیشتنیش، پێویست ناکات ئاوڕ لەو لاشانە بدەیتەوە لە دواتەوە داپۆشراون. لە کاتێکدا بیر لە پێکەوەژیان دەکەیتەوە، ڕەنگە بیریش لەوە بکەیتەوە لە عەرەبەوە فێری بووین و ئەو خێراتەی لە خاکەکەمان بۆیان جێ هێشتین، من بیر لەوە دەکەمەوە داگیرکەری خاکەکەمانن و ئەوان بە هێزی خۆیان بەسەرماندا زاڵ بوون. وەزیری ئازیز، شکستەکان هەستی تێکشکان دروست دەکەن. هەستکردن بە تێکشکانیش هیچ دەرمانێکی نییە، تەنیا سەرکەوتنە گەورەکان نەبێت. بەم ئاوایە نەك هەر خاکەکەمان بەدەست دەهێنینەوە، بگرە خۆمان و متمانەمان لە هێزماندا بەدەست دەهێنینەوە. ئەو دەم میللەتیش متمانەی بە پاشا بۆ دەگەڕێتەوە.

- بە لێکدانەوەی سیاسییش دەدۆڕێین خاوەنشکۆ، ئەگەر موسوڵمانەکان ڕۆیشتن هەڵبژێرن، ئەوا کشتوکاڵ و بازرگانی و پیشەسازیی دەستییش دەوەستن.

- هەڵبەت هەندێك موسوڵمان هەن بوونە کاسۆلیك و دڵسۆزییان بۆ کڵێسا نواند. سەرەڕای ئەوەش، هەڵبەت لە نێویاندا

هەن ئەو نیشتمانە هەڵدەبژێرن و لەو بترازێت نیشتمانیی تریان نەناسیوه.

- خاوەنشکۆ، مادام ئەمە دەزانیت، ئیتر چ پێویست بە...

- پێویست بەوە دەکات هەمووان ملکەچی دەسەڵاتم بن و موسوڵمانان دەرك بکەن ئەوان ئێستا لەژێر فەرمانی مندان. هەڵبەت ئەمە ئەوپەڕی خۆپەرستی و گەڕان نییە بە دوای شکۆی ساختەدا. ڕاستییەکەی؛ شکۆی وڵات پێوەستە بە شکۆی تاکەکەسیی منەوە، سەرکەوتنەکانیشم سەرکەوتنن بۆی. یەکێتیی ئەم خاکەش ئامانجێکە بەدوایەوەم و گەڕانەوەی نییە. دەبێت هەرچی بەروبوومیشی هەیە بۆ خەڵکەکەی بگەڕێتەوە، لە کاتێکدا داگیرکەران ژیانی شکست و دەستهەڵگرتن و سەرشۆڕی بژین.

**(لە ئەرشیفی پاشاییەوە،ساڵی ١٥٠٢)**

## 65

لێکچوون لە نێوان دایکم و باوکمدا دیار بوو. هەروەها جیاوازییەکانیش بەرچاو بوون. لە ساتێکدا، ئەو دەمی لەسەر گردۆلکەکانی کوینکادا بووین، تەماشای فرەوانی و بەرینیی شانشینمان دەکرد، ڕۆحی باوکمم بینی لە دایکمدا بوو. نیگا لابەلاکەی بە تەوێلی کەمێك بڵندییەوە ئەو دەمی ڕادەما، لە سیمایدا نەخشێنرابوو، وەك ئەوەی ئەو بێت. جیاوازیی بەرچاو لە نێوانیاندا ئەوە بوو، دایکم لە قسەکردنیدا دەربارەی باپیرانی مۆریسکیمان، وەکوو مێژوو لە دۆزەکەی دەڕوانی. ئاخۆ دایکم وەکوو دۆزێکی سیاسی دەیبینی؟ باوکم وەکوو ڕووداوێکی درێژبووەوەی نەبڕاوە لێی دەڕوانی، هۆیەکەی چەوسانەوەی ئایینییە. دایکم، بەپێی ئەوەی بۆی گێڕامەوە، مژووڵی ئاشکراکردنی ڕاستیی ئەو کەمینەیە بوو لە سۆنگەی ئاوات و ئومێدی سیاسییەوە تاڵاوی چەشت، تەنانەت ئەگەر چەوسانەوە ئایینییەکە لوتکەی شاخە بەفرەکە بووبێت. باوکم دوای دەرکردن خەونی بە مافی گەڕانەوەوە دەبینی. دایکم دەرنەکرا، لەگەڵ ئەو ڕێژە کەمە مایەوە دەرنەکران، ئەوی ئەو بینی باوکم نەیبینی. باپیرانی باوکم لە نێو ئەو نزیکەی نیو ملیۆن دەرکراوە بوون، باپیرانی دایکیشم لەو 10%ـە بوون لە تۆقین و هەستکردن بە ڕاونان ژیان. لەبەر ئەوە، ئەو بەڵگەنامە و

دەستنووسانە لای دایکم ڕاستیگەلێکیان دەگەیاند کەس چاوی پێیان نەکەوتبێت. ئەرکی ئەو ئەوەیە خەڵکی بیانبینن. هەمان ئەو بەڵگەنامە و دەستنووسانە بۆ باوکم ئاماژە و بەڵگەی ئەوەیان دەگەیاند ئێمە سەر بەم خاکەین.

کاتێك لەسەر سەکۆ مەرمەڕەکە دانیشتبووین، دایکم بۆی گێڕامەوە، لە میانەیماڵەکانی باوباپیرانی دەرکراومانەوە دەمانبینی، ستەمی ئایینی لە قووڵاییدا ئایینیی نەبووە، بەڵکوو سیاسی بوو. "یەکێتیی ئیسپانیای کاسۆلیکی ئامانج لێی ئەوە نەبوو ببێتە هێمای کاسۆلیکیزم، بەڵکوو کۆشان بووە بۆ پێکهێنانی ئیمپراتۆریایەکی بەهێزی سیاسی و چوونە ناو چاخی ڕێنیسانسەوە".

هەندێك لەو بەڵگەنامانەی چاوم پێیاندا خشاند ئاماژە بە موسوڵمانان دەکەن وەك ڕێگرێکی سیاسی لە بەردەم بەدیهاتنی ئەم ئیمپراتۆریایە، وەکوو پاشایانی کاسۆلیك بۆی چووبوون. دایکم ڕازی نەبوو و لەو سووتاندن و دەرکردن و ستەمەی نەدەبوری، بەڵام بۆچوونێکی هەبوو جیاواز لەوی باوکم.

"ئایین تەنیا ئامرازێك بووە بۆ حەشامات دروستکردن، تەنیا دروشمێکە نەزانان لە دەوری دەئاڵێن. ئامانج لێی دەسەڵات، دەستبەسەرداگرتن، سیاسەت بوو. چما وا دەزانیت خۆشەویستیی بۆ دەسەڵات بەوەندە وازی هێنا مۆریسکییان وەدەر نرێن؟ کەواتە کشانی جەنگ لەگەڵ ئیتاڵیا و فڕەنسای کرستیان چۆن لێك دەدەیتەوە؟! ئەوە شێتییە".

ئەو شێتییە گەیشتە ئەمریکای لاتین، بۆ ئەوەی کوشتارەیلێك بنێنەوە ناویان لێ نرا ئەفسانەی ڕەش. قەسابخانەگەلێك لەپێناو

ئاییندا نەکران، بەڵکوو بۆ دەسەڵات بوون. لە دۆخی ئێمەی مۆریسکیشدا، یەکەمین جار وا دێتە بەرچاو پاڵەوانەکان قەشەکان بووبن. ئەمەش ڕاست نییە، دایکم دەڵێت، قەشەکان ئامرازێك بوون بە دەست دەسەڵاتەوە. دەسەڵاتی سیاسەت دەسەڵاتی ئایینیی بە هەل زانی بۆ بەدەستهێنانی ڕەوایی.

گەڕاینەوە ماڵەوە و دابەزاینە ژێرزەمینەکە، دایکم هەندێك دەستنووسی نوێی پێ نیشان دام ئاماژە بەو نرخانە دەدەن جوولەکە و موسوڵمانەکان لە ئەنجامی شێتیی دەسەڵات دایان. هەندێك دەستنووسی دیش ڕەخنەیان لە دەسەڵاتدارە موسوڵمانەکان دەگرت و ئەو پیرۆزییەی لەسەر هەڵدەگرتن بەدەستیان هێنابوو. تەنیا لەبەر ئەوەی موسوڵمان بوون لە ڕووبەڕووبوونەوەی کاسۆلیکییاندا، یاخود ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت ڕووداوی دەرکردنەکە بە دڵڕەقییەکەی ڕووداوەکانی تری داپۆشی.

بەپێی ئەوی خوێندوومەتەوە فەرمانڕەوایانی موسوڵمان فریشتە نەبوون. بە درێژایی کات دوای ڕێنماییەکانی پێکەوەژیان نەکەوتوون، مەبەستیشیان پێڕەوکردنی بەهاکانی ئایین و بڵاوکردنەوەی نەبووە. لە کۆتاییدا ئامانجیان دەسەڵات و دەستبەسەرداگرتن بووە، بەدیهێنانی گەورەترین بڕی تالانی. فەرمانڕەوایی کوڕی خۆم. فەرمانڕەوایی و دەسەڵات، دایکم گوتی.

ڕووخان لە سۆنگەی ئەوەوە نەبوو پاشایانی کاسۆلیك بەهێز بوون، بگرە لەبەر ئەوە بوو لاوازی دزەی کردبووە هەموو

کونجوکەلەبەرێکی دەوڵەتی ئیسلامییەوە. بە لای منەوە گرینگ نییە کێ بەهێزە و کێ لاواز، تەنیا مێژووی باوباپیرانم بوو وای لێ کردم دووی هۆکارەکانی ڕاگوێزان و دەرکردن بکەوم.

یەکێك لە دەستنووسەکانی محەمەدی باپیرم، کە دەگەڕێتەوە بۆ دوای کەوتنی غەرناتە، بە ڕێزەوە ئاماژە بە ئەبوعەبدوڵلای سەغیر دەکات. بەڵگەنامەکە سیفەتی لاوازیی لێ دوور دەخاتەوە و بە "فەیلەسووف و ڕەشید"ی وەسف دەکات. لە کۆتاییی دەستنووسەکەدا باپیرم ئاماژە بەوە دەکات، کە ئەبوعەبدوڵلا عادی خوێنی ڕشتووە، ئەگەر ئەوە نەبووایا، ئەوا ڕووبارەکان دەبوونە ڕووباری سوور.

باپیرم باسی ڕێککەوتنی ئەبوعەبدوڵلای کرد، ئەوی کتێبەکانی مێژوو پشتگوێی دەخەن، تێیدا هاتبوو موسوڵمانان لەژێر سایەی تاجی کاسۆلیکیدا بە ئاشتییانە بژین. سرووتە ئایینییەکانیان بکەن و ماڵ و سامانی خۆیان بپارێزن. کەچی دوای دە ساڵ هەردوو پاشا دژی ڕێککەوتننامەکە وێستانەوە. ئیدی ئەوی ڕووی دا ڕووی دا، تەنیا خەڵکە موسوڵمانەکەش وەکوو هەموو ئەو گەلانەی باجی هەڵەی فەرمانڕەواکانیان دەدەنەوە، باجەکەیان دایەوە.

# 66

ئێوارێ، بە شەقامەکانی کوینکادا سووڕاینەوە. لە کاتدراییەی سانتا ماریا و سان خولیان نزیك بووینەوە. لە نێوان خانووەکانی سەدەی ناوەڕاستدا بە مەیدانە بچووکەکەدا پیاسەمان کرد. لەوانەیە بە بان شوێنپێیەکانی محەمەد دی مۆلینا و عەبدوڵلا مەریەم و خوان و ئایشێدا ڕێمان کردبێت. دوور نییە پێمان بەو گۆلەی داپیرە کارمنی کۆرپە، تێیدا دانیشت تەڕ بووبێت. ڕەنگە بەسەر سەکۆکانی دادگەکانی پشکنین و خوێنی باوباپیرانماندا ڕۆیشتبین. بە هێوری هەنگاومان دەنا، بۆ ئەوەی دەنگەکانی ڕابردوومان ببیسین. لە کاتێکدا ڕێمان دەکرد، دایکم چیرۆکی هەر ماڵێکی بۆ دەگێڕامەوە. خەڵکی شارەکە دەیانناسی. بە زەردەخەنە و دوو ماچەوە سڵاویان لێ دەکرد. کوینکا لە ئامێزی دەگرتین. شارە گەرمیبەخشەکەی ئێمە بوو. خەڵکەکەی ئەو کات و تاکوو ئێستاش دەستی خۆشەویستییان بۆ درێژ دەکردین. لە شارەکەمدا کە لێوەی هاتم، هەمیشە ئارەقەم دەکرد. لە مەدرید تینوو بووم. لە کوینکا هەستم بە ڕەزامەندی کرد.

دایکم گۆچانی فڕێ دا و خۆی بە دەستمەوە گرت. گوتی: "دەبێت هەرچی دەستنووس هەن ئاشکرا بکرێن. بیرۆکەی باوکت لەسەر پاراستنی نهێنیی ڕۆژگاری بەسەر چوو".

من به بێدەنگی گوێم بۆ ڕادێرابوو، ئەو دەیگوت: "باوکت بێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە، دوای نەریت کەوت. باپیرانمان بە نهێنی و ترس لە سزادان دەستنووسەکانیان پاراست. ئێستا، هیچ سزایەك لە گۆڕێدا نییە. دەستنووسەکان مافی هەمووانن. مێژووش مافی هەمووانە".

# 67

"کوڕەکانی بە دزیی ئەوەوە لە ماڵە دراوسێیان گۆشتی بەرازیان دەخوارد".

**لە دادگاییکردنی ئیزابێل گۆنسالس، ئافرەتێکی مۆریسکیی خەڵکی "سان کلیمەنتی"یە.**

**تاوانەکەی: گۆشتی بەراز لە ماڵەکەیدا لە کوڕەکانی حەرام دەکات. ساڵی ١٦٠٥.**

## 68

بۆ سەرلەبەیانی، دایکم نیگاری باپیران و داپیرانمی لە دالانی ژێرزەمینەکەدا بۆم ڕاخست. نیگارەکان واژۆی نیگارکێشەکەیان بەسەرەوە نەبوو، بەڵکوو تەنیا ناوی کێشراوەکە. نیگارەیلێك لە دایك و باوکم دەچوون. دایبابم نەك هەر دەستنووسەکانیان پاراست، بگرە سیماکانیان وەکوو میراتییەکی لەناونەچوو هەڵگرتن. دەکرێت لە میانەی بەدواداچوونی نیگارەکاندا ئەو شاراوانە بزانرێن دواتر مێژوونووسانی ئەو قۆناغە تۆماریان کرد.

لە نیگارەکەی محەمەد دی مۆلینا و عەبدوڵلای کوڕی بە ڕوونی هەست بە شانازیکردن و هێز دەکرێت. نیگای هەر یەکێکیان پڕ بوو لە ترووسکەدانەوە، تەنانەت جلەکانیان دەوڵەمەندانەتر بوون. مەریەم بە چاوە خڕ و قژە ڕەشەکەی و سپێتییە کەمێك برۆنزییەکەیەوە وەك شاژنێکی تاج بەسەر، تابڵێی شۆخوشەنگ بوو. ئەو باپیرانەی دوای کەوتنی غەڕناتە هاتنە دنیاوە، وێڕای ئەوەی "لامانچا"، کە کوینکا دوای کەوت، بەر لەو بە ساڵانێکی زۆر داگیر کرا، خەریك بوو نیگەرانی و پشێوی و ترس لە نیگاکانیاندا دەرەوینەوە، بۆ نموونە، نیگاکانی کارلۆس لەسەر پنتێکی دوور و نەزانراو چەقیبوون. کەوتنی غەڕناتە وەکوو لە نیگارەکاندا دیارە، دوا پووش بوو هەر نوقومبوویەك خۆی پێوە هەڵبواسێت. نیگارەکانی باپیرانی

نوقومبووم گۆڕان بۆ مۆنییەك ئومێدی بزەخەنەیەکیان دەکرد.

دایکم پیلی گرتم و خۆی دایە بان قۆڵمدا. سەرلەنوێ بە شەقامەکانی کوینکادا سووڕاینەوە و بە گردەکەی شاردا سەر کەوتین و لای گۆڕستانی سان ئیسیدرۆ دابەزاین. لەوێ، دایکم لە نووسینێکی مەرمەڕی هەڵواسراو بەسەر دەروازەیەکدا نزیکی کردمەوە، نووسرابوو "محەمەد دی مۆلینا و خانەوادەکەی". دایکم دەرگەکەی کردەوە و چووینە ژوورێ. لەسەر کێلی گۆڕەکان ناوی باپیران و داپیرانم نووسرابوون. دایکم ئاماژەی بە کێلێك کرد، ناوی باوکم و مێژووی کۆچکردنیم خوێندەوە.

دایکم گوتی، لە خەونیدا درەختێکی گەورەی بینیوە بە قەبارەی شارێکی مەزن، گەڵاکانی هێند بە چڕی ڕژان زەوییەکەیان داپۆشی. کاتێك بەسەر گەڵایەکی گەورەی هێندەی لەپی جووتیارێکدا نووشتایەوە، ناوی باوکمی لەسەر هەڵکۆڵرابوو. ئیدی زانی دوای چل ڕۆژ دەمرێت.

# 69

"خاتوونێکی مۆریسکی، که کارەکەر بوو لای خانەوادەیەکی دێرینی کرستیان و دڵسۆز بۆ ئایینی گەورەکانی، ناکۆکیی لەگەڵ پیاوەکەیدا بەردەوام بوو، چونکە هەمیشە سەرکۆنەی دەکرد، لەبەر ئەوەی نە عەرەبی و نە بیسمیلای دەزانی، بە گەمژەی وەسف دەکرد. پێی دەگوت، ئەمانەی پەروەردەیان کردوویت بەرەو گومڕاییت دەبەن، دەکۆشا بەوەی قایل بکات خاچ جگە لە داری یەکتربڕ هیچ نییە و نابێت مەریەم پاکیزە بێت و منداڵیشی ببێت، هەروەها عیسا پیاوێکی باش بووە، بەڵام نە خودا و نەیش کوڕی پەروەردگار بووە، هەروەها بەستەزمانە گەورەکان جوانکاریی بۆ دەکەن گوایا لە ئاسمان دوو کەسی پیرۆز هەن، وێڕای ئەوەی تەنیا خودا و محەمەد هەن".

**لە کاغەزەکانی دادگایی لویس لۆییس، مۆریسکییەکی "سۆکۆیامۆس"یە.**

**تاوان: سەرزەنشتکردنی ژنە بەکرستیانبووەکەی، ساڵی ١٥٨٠**

## 70

"سێ کوڕی گەورەی لە ژنی یەکەمی. دوو کوڕە بچووکەکەیشی لە لویسا مارتینیسی ژنی دووەمی".

**لە کاغەزەکانی دادگایی لویس بلانکۆ، مۆریسکییەکی کوینکایی.**

**تاوان: فرەژنی، ساڵی ١٤٨٢.**

# 71

**له کاغەزەکانی خوان دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٦٠٩**

(2)

میگێل گیان، بە کۆڵەپشتەکانمانەوە لەماڵەکەمان دەرچووین. بەدەم فرمێسکڕشتنەوە ماڵئاواییمان لە دیوارەکان دەکرد و هەستمان دەکرد ڕۆح گەیشتووەتە کونە لووتمان و دەیەوێت دەربچێت، تاکوو لە ماڵەکەماندا بمێنێتەوە. ئەودەم تۆ دوانزە ساڵان بوویت، مانوێل دوو ساڵ لە تۆ بچووکتر بوو و خواناش پێنج ساڵ، کارمن هێشتا نەبووبووە دوو ساڵان.

لە گۆڕەپانەکەی کوینکا وێستاین چاوەڕوانی گالیسکەی پۆلیس بووین، بەرەو ڕووگەیەکیان دەبردین خۆمانیش نەماندەزانی بۆ کوێ؟! کەسوکارمان تاکوو دواهەناسە لەو شارەی دەریپەڕاندن، لە دەورمان مانەوە.

میگێل گیان، تۆ خەمبار بووی، خەمبارییەکەت لێ نەگەڕا بگری، هێند قایم بوویت تەنانەت بە ئارامی بەرسڤی پرسیاری براکانت دەدایەوە. کوڕی خۆم، ئەو دەم وانەیەکت فێر کردم

ژیان فێری نەکردبووم، ئەو وانەیەی ئەوانی دی خەمبار نەکەم.

کاتێك گالیسکەکان نزیك بوونەوە، زمانمان هەڵنەدەهات، چاوانمان هاتنە ئاخاوتن، لەپڕ لە سەرماندا لەرزێك دەتگوت هەڵسانەوەی سەرەمەرگە دایگرتین، نەمانزانی لە کوێوە هات؟! کابرای پۆلیس لێمان نزیك بووەوە و لە کاغەزێکدا ناوی ماریا و مانوێل و خوانا و کارمنی خوێندەوە، بەو دڵڕەقییەی لە پیاوانی پۆلیسم بینیبوو، گوتی: "ئێوە لێرە دەمێننەوە"، ئیدی بە دەستی ئاماژەی بۆ کردین، تاکوو من و تۆ بە تەنیا سوار بین. دەبێت ئەو ساتەت لە بیر بێت میگێل، ساتی قیژە و هاواری دایکت، کە زایەڵەی لە هەموو گردەکانی کوینکادا دەنگی دایەوە. هاوارێك هەستی یارۆی پۆلیسی نەجووڵاند، کە زۆر بە ساردییەوە گوتی، فەرمانی قەشەیە. دواتر ماریا پریاسکەیەکی بچووکی دایە دەستت نیگاری براکانتی تێدا بوو، بۆ تەواوکردنی ڕۆژەکە کێشابوونت، ئەوەتا ئێستا هەڵتگرتوون نەکوو سیمایانت بیر بچێتەوە. هەروەها پریاسکەکە هەندێك کلیلی ماڵەکەمانی تێدا بوو، ژمارە٩٧، ماڵی عەبدوڵلای باپیرمان. ئەو ڕۆژەی من دەمرم، بۆ یەکجاری کلیلەکانت ڕادەست دەکەم، تاکوو بگەڕێیتەوە. بیرت نەچێت دەستنووسەکانی باپیرانمان لەوێن.

لە مەودای گۆڕەپانی گالیسکاندا ئاوڕمان دەدایەوە. ماریا لە ئاستانەی ماڵ وێستابوو بە تەنیشت مانوێل و خوانا و کارمنەوە. ئەسرینی ڕژاویان گەیشتە بەر پێمان. پاژنەی تەڕ کردین. لە ئاوەکەدا کارمن ڕووەو من ڕای کرد. ڕەنگە نەیزانیبێت ئەوە دوا دیدارمانە، بەڵام مەزەندەی کرد. میگێل گیان، منداڵان لە ئێمە زیاتر دەزانن. دەزانن، چونکە ئەوان دنیا بە ڕۆحێکی بێگەردەوە دەبینن. چاوەکانی کارمن هەموو شتیان گوت. نیگاکانی هی

یەکێك نەبوون بە هیوای چاوەڕوانییەوە ماڵئاوایی بکات، بەڵکوو هی دوا ماڵئاوایی بوون. خوانا بە پاساوی گەڕاندنەوەی کارمن بەرەو لامان ڕای کرد. مانوێلیش لەبەر دوو خوشکەکەی ڕای کرد. لە کاتێکدا دوا ئامێزم لێ دەدان، ماریا بوورایەوە و کەوتە سەر زەوی. کەوتە گۆلێك ڕۆندکەوە. بەر لەوەی بەرەو لای ڕابکەم، کابرای پۆلیس ڕایکێشتین و فڕێی داینە گالیسکەکەوە. کارمنی لە نێوان دەستەکانمدا دەرهێنا و فڕێی دایە گۆلەکەوە، ئەویش دانیشت، تاکوو تەڕایی گەیشتە سینگی.

لە گالیسکەکەدا من و تۆ تەماشای دواوەمان دەکرد. لە گرد و خانووە لە بەرد داتاشراوەکان ورد دەبووینەوە، ماڵئاواییمان لە خۆری ئاسۆکە دەکرد. چەندێك گالیسکەکە بەرەوپێش بچووبایا، دڵمان لە سینگمانەوە دەردەهات. ملمان پتر بادەدا. بیرت نەچێت میگێل: ئیدی لەو ساتەوە بە ئەستۆگێڕیی ماینەوە. لەو ساتەوە بە چاوانێکەوە ڕێ دەکەین هەمیشە ڕوو لە دواوەن.

## 72

ڕۆح لە شەوی ئازاردا نەبێت هەڵنایەت
چما خاك بە گریانی باران نەبێت گوڵ دەگرێت؟!

**"جەلالەدینی ڕۆمی"**

## 73

"پاش گەڕانەوەی لە فلیقاندنەوەی ترێی شەراب، ئەژنۆکانی تاکوو خوار پێی بە ئاوی گەرم شوشتن. پاشان لویسای مۆریسکی و مامان داوای لە دراوسێکەی (ژنی شایەدەکە) کرد قژی ببڕێت، تاکوو دواتر بە ئاوی گەرم خۆی بشوات".

**لە دادگاییکردنی لویسا لۆپیسەوە، ژنە مۆریسکییەکی سۆکۆیامۆسییە. دادگەکانی پشکنین بە بسمیل و دەستنوێژگرتن تاوانباریان کرد، ساڵی ١٥٨٣.**

## 74

**له کاغەزەکانی خوان دی مۆلینا**

**تەتوان/ ١٦٠٩**

### (3)

ڕێگە لە کوینکاوە بۆ تەنگەی جەبەل تاریق هەشت سەدەی خایاند. هەشت سەدە لە یەکەم چوونە ناوەوەی عەرەب بۆ نیمچەدوورگەی ئیبیریی دەستی پێ کرد، ئەمەش لەسەر داخوازیی خانەدانانی نەیاری ڕۆدریگۆ و بە هاوکاریی دۆن خولیانی فەرمانڕەوای سەبتە، بۆ تۆڵەسەندنەوە لە ڕۆدریگۆ خۆی دوای ئەوەی دەستدرێژیی کردە سەر کچەکەی، بڕیاری دا دەروازەی نیمچەدوورگەکە بۆ موسوڵمانان بخاتە سەر گازی پشت. هەشت سەدە لەوکاتەوە تاکوو دەرچوونمان لە ئێستادا میگێل، بە دەرکراوی. بەڵام ئایا سەرلەبەری مۆریسکییەکان دەرکران؟ میگێل بیرت نەچێت، براکانت، ئامۆزاکانت لەوێن. خوێنت بە دەماری ئەوانەدا دەسووڕێتەوە بە فەرمانی پاشایی بۆ پاراستنی ئەم وڵاتە لە وێرانکردن مانەوە، هەروەها ئەوانەی

ڕفێنران تاکوو وەکوو کاسۆلیك بژین، هەروەها ئەوانەی خۆیان مات دا بۆ بەرگری لە ڕابردوویان ئەملا و ئەولایان کرد. میگێل، خوێنی ئەندەلووسی بە دەمارەکانی تۆدا دێ و دەچێت، خوێنی تێکەڵاو.. لە سیمای ڕوخسارت بڕوانە.

لە سەرووی هەموو ئەمانەوە، وەك من بیر بکەرەوە میگێل: تاکوو چ ڕادەیەك ئێمە بۆ عەرەبەکانی بەرایی، یاخود ئەمازیقەکانی بەرایی دەگەڕێینەوە؟ ئێستا کێ دەتوانێ ئەوە دیاری بکات چ خوێنێك بە دەمارەکانماندا دەسووڕێتەوە؟ ئایا گوێت لەو زمانەیە لەگەڵتدا پێی دەدوێم؟ ئەوە قشتالییە. ئایا داونەریتەکانی ڕۆژانە دەبینیت؟ ئەوە دابی ئەو خاکەیە لەسەری لەدایك بووینە. بێگومان نەریتەکان تێکەڵاون، هەندێکیان لە باپیرانی کۆنمانەوە دێن، هەندێکیشیان لە باوباپیرانی نوێمانەوە. لێ بیرت نەچێت پاساوی دەرکردن بەتاڵە. دەوڵەتی عوسمانی لە باکووری ئەفریقا شوێنەواری ترسی بڵاو دەکردەوە، بەڵێ، بەڵام تۆمەتی ئەوەی ئێمە ناپاکین و لەگەڵ عوسمانییاندا هاوپەیمانین، هیچ بنەمایەکی نییە، تەنانەت پاساوی ئەوەی ئێمە موسوڵمانین و لەگەڵ موسوڵماناندا هاوپەیمانی دەبەستین بێ پشتیوانی بوو، غەرناتە وەکوو دوا بەرجەستەبوونی کەوتن نەکەوت، تاکوو پاشا موسوڵمانەکان لەگەڵ پاشایانی کاسۆلیك دژ بە پاشایانی موسوڵمان هاوپەیمانییان بەست. ئێمە خۆفرۆش نەبووین میگێل، ئێمە دڵسۆزی خاکی خۆمان،ماڵمان، کار و ڕۆڵەکانمان بووین. دڵسۆزیمان لە سەرووی هەموو شتەکانەوە، بۆ ڕۆحی خۆمان بوو، کە لەوێ هاتە دنیاوە، هەروەها بۆ یادەوەرییەکانمان، کە ڕۆژ دوای ڕۆژ چرۆیان کرد. ئایینی هیچ کەسێك مژۆڵی

نەکردبووین، حەزمان بە هیچ نەبوو تەنیا وەستان لە پرسیارکردن لە بارەی ئایینەوە.

پاشان میگێل چ ئاوەزێك دەتوانێت بگاتە گەمژەیی هاوپەیمانی لەگەڵ دوژمندا دژ بە کەسوکاری خۆمان، دوژمنێك هاتووە خاکمان داگیر بکات، خوێنمان بڕێژێت، بەروبوومەمان ببات و نەخشەمان بۆ بکێشێت لەسەری بڕۆین، پاشان وەکوو داری ئاگردان بەکارمان بهێنێت. دەزانی میگێل، تەنانەت شۆڕشی بوشاراتیش لەپێناو داد و ئازادیی بیروباوەڕدا هەڵگیرسا، دژی ڕاوەدوونان و دادگەکانی پشکنین هەڵگیرسا، بە مانایەکی دی، میگێل، لەپێناو پێکەوەژیان هەڵگیرسا نەك شەڕ، لەپێناو وەستاندنی خوێنلەبەررۆیشتن نەك لەپێناو بەفیڕۆدانی. کاتێك هەڵگیرسا پەنامان بۆ ئەو عوسمانییانە نەبرد گەیشتنە جەزائیر، هەر ئاوڕمان لێ نەدانەوە. ئاوڕمان نەدایەوە، چونکە هەواڵەکانی وڵاتی شام و میسرمان پێ دەگەیشتن، نەماندەویست ستەم بە ستەم، پاشا بە پاشا، وتەبێژێك بە ناوی خواوە بە وتەبێژێکی دی بە ناوی خواوە بگۆڕینەوە. پێمان خۆش بوو، وەکوو چۆن ئێستاش پێمان خۆشە، لە ئاشتیدا بژین. تەنانەت ئەو تورکانەی وەکوو دەسیسە هاتن، تاکوو بزانن چی دەڵێین، تەنیا خۆشەویستیی بۆ خاك و دڵسۆزیی بۆ نیشتمانیان لە ئێمە بینی. تەنیا لەبەر ئەوە بوو عوسمانییەکان بەرەو ئەندەلووس پێشڕەوییان نەکرد.

# 75

**له كاغەزەكانی خوان دی مۆلینا**

**تەتوان/ ١٦١٢**

**(4)**

**گوێبگرە میگێل...**

له نێوان مێژووی هاتنەژوورەوە و مێژووی دەربەدەریدا، مەمالیككگەلێك ڕاپەڕین و مەمالیككگەلێك كەوتن، هەمووان ماوەیەك پێكەوە ژیان و هەمووان ماوەیەك دژی یەكتر جەنگان، ماوەیەك ملبڕ بە گەڕ كەوتن و ماوەیەكیش خوێن ڕژا، ئیدی ژن و ژنخوازیمان پێكەوە كرد و خوێنمان تێكەڵ بوو. لەم هەموو ماوانەدا میگێل، فەرمانڕەوا نەبووین، خانەوادەگەلێك بووین عەودالی دوای ژیان بووین و دروستمان دەكرد، ئاسنگەری و دوكانداری و عەترفرۆشیمان دەكرد، له كشتوكاڵ و دروێنەدا ئیشمان كرد، نه خزمەتی سوپامان كرد و نەیش له ناو سوپادا بووین، چەكمان بە ڕووی كەسدا بەرز نەكردەوە و دەستمان بۆ كەس درێژ نەكرد. ڕێنوێنییەكانی محەمەد دی

مۆلینای باپیرە گەورەمان وەکوو دەستەواژەی پیرۆز بۆمان مانەوە، بژین و پێکەوە بژین و ئازاری کەس مەدەن، ڕۆحەکانماڵی خاوەنەکانیانن، ئەگەر لە دەرگەی ڕۆحەکانتان دا، ئەوا بە نەرمی لێی بدەن. بەڵام کوڕی خۆم، لە سەرەتا و کۆتایی قۆناغەکەدا، چەوساوانی سەرزەوی سووتەمەنیی ئاگردانەکانن، هەمووان سووتەمەنیی پاشایانین، لەپێناو یەك سەعات خۆگەرمکردنەوە لە زستاندا دەمانسووتێنن. بەڵام تاکوو نەبینە خۆڵەمێش هەست بەمە ناکەین.

لە ڕێگە بەرەو دەربەندەکە، بیرتە میگێل؟ ئەوە بوو بەلەمەکان چاوەڕوانمان بوون، گوێمان لێ بوو هەندێك دەیانگوت فڕێمان دەدەنە دەریاوە، دەیانگوت نەك هەر تۆڵەمان لێ دەکەنەوە، بەڵکوو تۆڵە لە دەریاش دەکەنەوە. جا کوڕی خۆم، جیاوازی چییە لە نێوان ئەوەی فڕێمان بدەنە دەریاوە، یاخود تووڕمان بدەنە سەرزەوییەك شارەزای نین؟!

لە دەربەندەکە بە هەزاران بووین لە هەموو شارێکەوە، لە؛ کوینکا، توڵەیتوڵە، پالنسیە، غەڕناتە، قوڕتوبە، قادیش و جەییان. لەوێ، هەمووان چاوەڕوانی چارەنووسی نەزانراومان بووین. هەر لەوێ، لە ناکاو کۆمەڵێك ڕێگر دەرکەوتن نەمانزانی لە کوێوە هاتن! ئەوە بوو ڕووتیان کردینەوە. دەکرێت پیاوانی تێکشکاو چ بەرهەڵستییەك بنوێنن؟! ئەگەر لە خاك و ماڵی خۆمان دەرکرابین، ئاخۆ بە ژیانمان بەرگری لە پارچەیەك زێڕ بکەین؟!

لە بەلەمە بچووکەکاندا، بە ژمارەی زۆریانەوە، دڵنیا بووم کۆتاییمان لێرە دەبێت. میگێل گیان، دەستم لە ملت کردبوو، تاکوو تۆ ڕزگار بیت، ئاخر تۆ هێشتا ژیانت نەدیتبوو، هەرچەندە لەوە خراپترت بینی. بەڵام تەمەنی تازەمان بۆ نووسرا.

## 76

**له كاغه‌زه‌كانی خوان دی مۆلینا**

**ته‌توان/ ١٦١٢**

(5)

**گوێ رادێره میگێل...**

له‌وبه‌ری ده‌ریاوه چه‌شنی ئاژه‌ڵی مرداره‌وه‌بوو تووڕیان داین. نه‌مانده‌زانی به‌ره‌و كوێ مل ده‌نێین. نه‌مانده‌زانی شه‌وه‌كه‌مان له چ ماڵێك به‌سه‌ر ده‌به‌ین و چ كارێك ده‌كه‌ین. هه‌زاران و هه‌زاران ده‌بووین. به زارۆك و ژنیانه‌وه. به په‌ككه‌وته و نه‌خۆشیانه‌وه. به كه‌لوپه‌لی سه‌ر شانیان و زامی خوێن له‌به‌ررۆیشتوویان. به سه‌دان كه‌شتی ده‌هاتن و له‌سه‌ر هه‌مان رۆخ هه‌ڵیانده‌ڕشتن و ده‌ڕۆیشتن. ته‌توان و فاس و ته‌نجه وه‌كوو نه‌فره‌تلێكراو لێیان ده‌ڕوانین. كه‌شتییه‌كان كه‌سوكارمانیان فڕێ ده‌دایه رۆخگه‌لێك نه‌مانبیستبوون. بۆ شارگه‌لێك شاری ئێمه نه‌بوون. تۆش میگێل لێم ده‌پرسیت ئێمه له كوێین؟! منیش نازانم له كوێین تاكوو وه‌ڵامت بده‌مه‌وه!

بەر لە هاتنمان شتێکمان لە بارەی تەتوانەوە دەزانی. هەندێك لە برا ئەندەلووسی و پاشان مۆریسکییەکانمان دوای کەوتنی غەرناتە پێش ئێمە لەوێ بوون. یاخود بە دیاریکراوی دوای دەرچوونی فەرمانی پاشایی بە بەکرستیانبوون، یاخود دەرکردن. ئەوانی ڕۆیشتن، بەپێی ئەوەی پێمان گەیشتووە، ڕووگەیان ڕۆخەکەی دی بوو. ئەوانی ڕۆیشتن، بەپێی ئەوەی پێمان گەیشتووە، زۆربەیان چینی باڵا بوون، خاوەن موڵك و خانەدان و فەرماندەی سوپا بوون. ئەوانە بە مێشکیاندا نەدەچوو، چۆن بە مێشکیاندا بچێت، بە ملکەچی لەژێر فەرمانی فەرمانڕەوایەکی کاسۆلیکدا بژین. ئەوانەی فەرمان دەردەکەن توانای دەرککردنی ئەوەیان نییە فەرمانیان بەسەردا بکرێت. چینە باڵاکان لەسەر دەسەڵات ململانێیان بوو، ئەگەر بەدەستی بهێنن ئەوا ڕیسوامان دەکەن، ئەگەریش شکستیان خوارد ئەوا دەڕۆن، تاکوو ئێمەی نەدار و بێچارە نرخی گوناهەکانیان بدەینەوە. ئەوان ڕۆیشتن و لە بەری ئەوبەرەوە سەقامگیر بوون. ئەو بەرەی ئێستا ئێمە لێی ئاکنجی بووینە.

شتێکمان هەمبەر هەواڵەکانی تەتوان دەزانی. چیرۆکی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەیمان بە دەستی سەربازانی مەنزەریی، یەکێك لە سەرکردەکانی لەشکری ئەبوعەبدوڵلا ئەلسەغیر دەزانی. سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی ئەو شارەی وێرانە بوو. فەرماندەی شکستخواردوو شارێکی بنیات نا غەرناتەی تەفروتووناکراوی بیر دەهێنایەوە، ئەو شارەی شکۆی سوور بوو، پاشان بووە پەڵەی نێوچەوانیان، لەو ڕۆژەوەی کەوتە ژێر دەسەڵاتی تاجی کاسۆلیکی. لەبەر ئەوەی ئەو سەرباز بوو، بڕیاری دا جەنگی نوێ هەڵگیرسێنێت.

لە کوینکا، هەواڵی ترمان لەبارەی مەنزەرییەوە بۆ هات، دەیویست تەتوان لە فاس جیا بکاتەوە. پێیان گوتین پەیماننامەی لەگەڵ پاشای پورتوگال ویستووە، بەوپێیە دەبوو تەتوان ڕادەستی پورتوگالییان بکات بۆ ئەوەی فاس بشکێنن، خۆی و خانەوادەکەیشی بڕۆن بۆ تونس.

میگێل گیان، ململانێکان ئاوا بوون. ململانێی دەسەڵاتێك ئێمە تێیدا کۆیلە بووین. ئاوا میگێل، ململانێی ئایینیی تویژاڵێکی ساختە بوو. ڕەنگە لە بەختباشیی ئێمە بووبێت پاشای پورتوگال بە شەڕی ترەوە تێوە گلابوو. ئەگینا خوێنی زیاتر دەڕژا.

لە تەتوان، لە بەردەم دەریا و لە نێو شاخەکاندا نووستین، چاومان لە ڕۆخەکەی دی بوو. لەسەر زەوی ڕاکشاین و بە بێدەنگی باوەشمان لە ڕۆڵەکانمان دا. خۆمان کردە خەو تاکوو بنووین. نەنووستین. کێ دەتوانێت لە شەوێکی وادا بنوێت؟! کێ دەکارێت لە نێو قشڵە و قەڵاکاندا بنوێت؟! کێ دەتوانێت تەنانەت قسان بکات. قسە بکات؟! بە چ زمانێك دەدوێین؟! هەر لە یەکەمین ساتی گەیشتنمان، بیرمە میگێل، خەڵکی شارەکە بە ڕق و ترسەوە لێیان دەڕوانیین.

برایانی ئەندەلووسیمان وەکوو کرستیان تەماشایان دەکردین، وێڕای ئەوەی ئیسپانیا بە بەهانەی موسوڵمانبوون وەدەری نابووین. عەرەبی تەتوانیش وەکوو ئیسپانی لێیان ڕوانیین، سەرەڕای ئەوەی ئیسپانیا بە پاساوی عەرەببوون دەریکردین. ئیدی لەم نێوەداماینەوە، نە سەر بەوانین و نەیش سەر بەمان.

لە ڕۆژانی بەراییدا، بۆ ئەوەی کێشە دروست نەکەین، بڕیارمان دا خۆمان دوور بگرین. ڕەنگە بڕیارەکە وای

گەیاندبێت، دووریش نییە واقعێکی سەپاو بووبێت. بۆچی بە ڕاشکاوی نەڵێم خەڵکی شار خۆیان لێمان بەدوور گرت! بۆچی بە ڕاستی نەڵێم بە عەرەبی قسانمان نەدەکرد و هیچ لێکگەیشتنێکی شیمانەکراو لە نێوانماندا نەبوو! بۆچی نەڵێم ئەندەلووسییەکان، برایانی چەشنی ئێمە دەرکراومان، بە فیز و لووتبڵندییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کردین. لە دیدی ئەوانەوە، ئێمە بە زۆر دەرکراین، ئەوانیش بە سەری بڵندەوە دەرچوون. ئێمە هەژار و ئەوانیش ئاغا. میگێل گیان، ئێمە تەنیا؛ ئاسنگەر، وەرزێر، کتێبفرۆش و کرێکاری بێبەها بووین.

بەهەر حاڵ، ئەنجامەکەی یەکە: خۆمان دوورەپەرێز گرت و بە زمانی خۆمان قسانمان کرد. میگێل گیان، ئایا زمانی خۆمان بپارێزین، یاخود دەبێت لە سەرزەوییەکی نوێدا بتوێینەوە؟!

## 77

**راپۆرت**

"ئەم کریستیانە تازانەی گوندی لارۆدا، هەراشەکانیان سەرلەبەریان نوێژی ئێمە و ڕێنماییەکانی پەروەردگار دەزانن. بۆیە ئەمە دەزانین، چونکە هەر سێ مانگ جارێك بە وردی تاقیان دەکەینەوە. ئەوان گوێ لە نوێژەکانی کلێسا دەگرن و بۆ شاییەکان ئامادە دەبن، بەلام لە ترسی سزا ئەمە دەکەن، لە ناخیاندا هیچ هەست بە شوێنەواری کرستیانیزم ناکەم. ئەمانە خێر ناکەن، لە هەفتەی ئازارەکاندا ئامادە نابن، نهێنیی پیرۆز ناپارێزن و ددان بە گوناهەکاندا نانێن... لە گشت جەژنەکانیشدا مەست دەبن و بە زمانی عەرەبی گۆرانی دەچڕن، لە ئاهەنگەکانیشیاندا تامبرا دەچڕن. ئایکۆنەکان هەڵناگرن و وێنە و تەسبیح لە ماڵەکانیاندا دانانێن. بە ڕاستی دەڵێم ئەمانە هەموویان بە عەرەبی قسە دەکەن و بە بایەخی زۆرەوە منداڵەکانیان فێر دەکەن".

**خوان مارتینیس دی بیرۆنا، قەشەی لارۆدا، ساڵی ١٥٨١**

# 77

**له کاغەزەکانی خوان دی مۆلینا**

**تەتوان/ ١٦٢٢**

(6)

ئەمڕۆ نامەیەکمان لە کەسوکارمان لە قەڵای خۆڵینەوە پێ گەیشت. ساڵانێك نامەمان بۆ ناردن بێ ئەوەی وەڵامێکمان لەوانەوە دەست کەوێت. گوتیان، تەنیا یەك نامەیان بەدەست گەیشتووە، پیاو چی بکات ئەگەر لەژێر هەڕەشەی گەمارۆدا بێت.

من وای بۆ دەچم ئەو نامەیە بێت هیچمان تێدا نەگوت، ئەوەندە نەبێت "چاوەڕوانی هەواڵتانین، بۆ ئەوەی خاترجەمبین". وای بۆ دەچم ئەو نامانەی تێیاندا باسی ئەوەم دەکرد لێرە چ ڕۆژانێکی سەخت بە ڕێ دەکەین، نەگەیشتوون. شتێکی سروشتییە نەگەن. ئەوی بکوژێت و بسووتێنێت و دەربکات دەبێت بێ ئازاری ڕەوشتی ڕێگە لە نامەناردن بگرێت. سوپاسی پەروەردگار دەکەم، وازیان لە هەندێك لە برایان لەوێ هێنا.

ناچار بوون ڕێگە بە هەندێك لە کەسوکارمان بدەن بمێننەوە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری کشتوکاڵ. ئەمە جۆرە دڵنەواییەکمان دەداتێ.

نامەی کوڕانی یونس زۆری نەگوتبوو. ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت چونکە بەدەستی یەکێك لە بازرگانەکان نێررابێت، کەسیش لە پشکنین و سزا خاترجەم نییە. لە نامەکەدا هاتبوو "باش بن. ژیان سەرەتا و کۆتاییە، ئێوەش لە سەرەتایەکی نوێدان، ئاوڕ لە دواوە مەدەنەوە".

بە کردەنییش دەستمان بە ژیانێکی تازە کرد. بەڵام تازەش درێژبوونەوەی کۆنەکەیە. وا دیارە هەموو حەکایەتەکان تەواوکەری یەك حەکایەتن.

ڕۆحمان لە کوینکایە. وێڕای تێپەڕینی پتر لە دەیەیەك هەستمان بە هیچ گونجانێك لەگەڵ خاکە نوێیەکە و خەڵکەکەیدا نەکرد. کەچی میگێل و هەندێك لە کوڕان خەریکە کەمێك لەگەڵ منداڵانی هاوتەمەنیاندا ڕادێن، لەگەڵ کاتیشدا وشەی تازەی عەرەبیی وا فێر دەبن ئێمەی گەورە لە ماناکانیان ناگەین. ماوە ناماوەیەکیش میگێل دەچێتە مزگەوت و فێری قورئانخوێندن دەبێت.

## 78

**پەراوێز:**

کاتێك هێزە داگیرکەرەکانی ئیسپان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە گەیشتنە تەتوان، سەربازەکان سەیریان هاتێ دانیشتووانەکەی بە ئیسپانیی کۆن دەدوێن. سەرەتا وایان زانی بۆ ماستاوکردن بڕێك وشەی بیانی فێر بوونە. کەچی دوای چەند ڕۆژێك زانییان دانیشتووانەکە وەکوو زمانی دایك بە ئیسپانی دەدوێن، لێ زمانی سەدەی نۆزدەیە. کاتێك چوون بۆ لای سەرکردەکانیان، تاکوو پرسیاری ئەوەیان لێ بکەن، وەڵامیان بەدەست نەهێنا. دەمێ لە خەڵکەکە نزیك بوونەوە، تاکوو پرسیاریان لێ بکەن، وەڵامیان یەکلاییکەرەوە بوو: "ئیسپانی زمانمانە، چونکە ئێمە ئەندەلوسیین. چما وەدەرنانی مۆریسکییانتان لە ساڵی١٦٠٩دا بیر نایەت؟ ئەو مۆریسکییانە ئێمەین. ئیدی لەو ڕۆژەوە لێرە دەژیێین و زمانی دی نازانین!"

هەڵبەت مۆریسکییەکان فێری وشەی عەرەبی بووبوون، بۆیە عەرەبییان تێکەڵ ئیسپانی کردبوو، تاکوو بۆ خۆیان زمانێك دروست بکەن دواتر بووە بوارێك بۆ لێکۆڵینەوەی زمانەوانان.

# 79

## له کاغەزەکانی خوان دی مۆلینا

### (7)

**خۆشەویستم خوان...**

نازانم ڕۆژەکان چۆن تێدەپەڕن. ئەوی دەیزانم ئەوەیە ئێمە له چاوەڕوانیدا دەژین. چاوەڕوانیی ئەوەی لەگەڵ میگێلدا بێت. یاخود چاوەڕوانیی ئەوەی ئێمە بێین بۆ لات. نازانم بێ تۆ چی بکەین. نازانم تاکوو کەنگێ دەریا لێکمان جیا دەکاتەوە. خۆشەویستم، چما بۆمان نووسراوە بۆ هەمیشە غەریب بین؟ ئایا دەزانیت چۆن بتوانین مەوداکان ببڕین؟ له ماڵ، ژیان ونە. هەموو شتەکان له خاڵی کۆچکردندا وێستان. منیش تێیدا دەخولێمەوە. مانوێل و خوانا بەردەوام پرسیارت دەکەن. ئێستا کارمن ئەو منداڵە بەختەوەرە نییە، له چاوترووکانێکدا بووەتە پیرەژن.

خوان گیان، ئایا دەزانی چۆن منداڵان پیر دەبن؟ چۆن پێکەنین دوور دەکەوێتەوە؟

خۆشەویستم خوان...

میگێل چۆنە؟ دەزانی هەست بە چی دەکەم؟ دەڵێی خەنجەرێکی تیژ لە سینەمدایە. ڕۆحم بۆی خوێنی لێ دەچۆڕێت. لە چ شەرعێکدا هەیە پیاو لە هاوسەرەکەی بکەنەوە؟! برا لە براکەی؟! دایك لە کچەکەی؟!

خۆشەویستم خوان...

زۆر لێرە چاوەڕێ ناکەم. ئەگەر دوا قۆناغ دەرکردنی بێ گەڕانەوە بێت، لە کوێ بیت دێم بۆ لات.

**ماریای خۆشەویستت**

**کوینکا/ ١٦١٠**

# 80

دایکم بۆ قەڵای خۆڵین کۆچی کرد، منیش لێرە لە ژێرزەمینەکەدا مامەوە دەستنووسەکانی باپیرانم دەخوێنمەوە.

ئێستاکێ ڕازی ملگێڕیی خانەوادەکەمانم بۆ دەرکەوت. بینیم چۆن هەندێك لە باپیران بێ ئەوەی سوودێکی هەبێت هەوڵیان داوە خۆیان لەو دەردە بەدوور بگرن. تەنانەت دۆزینەوەی مێژوو لە چل ڕۆژی دواییدا ڕزگاریبەخش نەبوو. ئێمە ئاوا لەدایك دەبین، بە دەردێك لە ڕێگەی جینەکانەوە دەگوازرێتەوە. سوودی دۆزینەوەکە لە زانینی هۆکارەکانی دەردەکە قەتیس دەمێنێت نەك چارەسەری. پاشان ئاتاجی مۆری خڕ نیین لەسەر سکمان وەسفمان وەکوو مۆریسکی هەڵبگرێت، نەیش نیشانە بۆ سەختیی جودایی و سەرهەڵگرتن، ئیدی نموونەکە دیارە.

ئاخۆ دایکم لەبەر ئەوە لە باوکم دوور کەوتەوە؟! ئاخۆ لە چارەسەری بێئومێد بوو؟! لە چارەسەرمان؟! یاخود چارەسەری هەبوو و باوکم ڕەتی کردووەتەوە؟!

ئاخۆ دایکم ئەو هەموو ماوەیەی لە قەڵای خۆڵینەوە بۆ کوینکا بڕیوە، تاکوو بەری نەفرەتم لێ بگرێت؟! لەسەرمی هەڵگرێت؟! دەبێت دوا گوتاری باوکم وەسیەتی نەبینراوی لە خۆ گرتبێت، ڕۆژێك دەردەکەوێت و دەبێت جێبەجێ بکرێت؟!

چەند پرسیار چاوەڕێی وەڵامن، تاکوو ناسنامەم یەکلا بکەمەوە؟!
ئاخۆ پێویستە یەکلای بکەمەوە؟!

دایکم گوتی، لێکدانەوەی باوکم بۆ ڕاسپاردەکانی پاراستنی دەستنووسەکان بە نهێنی پتر لە خوێندنەوەیەکی پیشەیی دەقەکە هیچی تر نییە، بێ قووڵبوونەوە لە کۆنتێکست (سیاق). ئاخۆ دایکم ڕاست دەکات باوکمی بینیوە؟! ئەو دوای پێشینانی کەوت بۆیە بووە سەلەفی، شاردنەوەی دەستنووسەکانیش دوای نەمانی هۆکارەکانی بەنهێنیبوون، تەنیا ترسێك بوو لە سێبەری بکوژێك؟

لەگەڵ ئەوەشدا، بڕوا دەکەم ڕاسپاردە ڕاسپاردەیە، با ڕۆحی وەسیەتکەر ئاسوودە بێت، ئەوی هیچی پێ ناکرێت، دەبێت وەسیەتەکەی بەجێ بگەیەنم. بیر لەوە دەکەمەوە چارەی ئەمە دوو شتە: تاکوو بتوانم کاغەزەکان لەبەریان بگرمەوە، پاشان بۆ خەڵکەکەی ڕابگەیەنم. یاخود بۆ خەڵکی ڕابگەیەنم، پاشان خەڵکەکە هاوکاری بکەن لە لەبەرگرتنەوە و وەرگێڕان؟

لە نێوان سندووقەکاندا، هەندێك مۆر، کەرەستەی جوانکاری، ملوانکەی زیو، شووشەی عەتر، پاوانە و گوارەی زێڕم بە ناوی "کارمن" بە عەرەبی دۆزینەوە. کارمن، کارمنی داپیرم.

## 81

"لە ڕووکەشدا چڵی درەخت بناغەی بەرەکەیە، لێ لە ڕاستیدا چڵ لەپێناو میوەکەدایە."

"ئەگەر مەیل و ئارەزووو بۆ میوەکە نەبێت، ئایا باخەوان دەبوو ڕەگی درەختەکە بنێژێت؟"

"درەخت هەر بۆ مانا لە بەرەکەیەوە لەدایك بوو، بەریش بۆ وێنە لە درەخت دروست بوو."

**"جەلالەدینی ڕۆمی"**

# 82

## له كاغەزەكانی میگێلی كوڕی خوان دی مۆلینا
## (میگێل دی مۆلینا)
## تەتوان/ ١٦٥٣

### (1)

له خەونمدا بینیم دوای چل ڕۆژ ماڵئاواییم له ژیان دەكرد. سەرەڕای ئەوەی باوكم ڕایسپاردبووم هەر لەو ڕۆژەی دەگەینە ئێره ڕۆژانه یاداشتەكانم بنووسم، بەڵام سەختیی ژیان و پشتبەستنم به باوكم لەم بارەوە، وایان لێ كردم جارێك تەمبەڵ ببم و جارێكیش نائومێد. نەمدەزانی، وەك چۆن ئێستاش نازانم سوودی نووسین چییه. وەكوو خەنجەرێك بەر دڵ بكەوێت تەماشای ڕابردوو دەكەم، وای بۆ دەچم نووسین چەشنی ئاگره، چەندێك هەڵیگێڕینەوە ئەوەندە گڕی ئازاری زیاتر دەبێت. لێ من ئێستاكێ لەم شوێنەی ئێستامەوە له كەناری ژیانداء وای بۆ دەچم تۆماركردن سوودی خۆی هەیه. سوودی تۆماركردن، ئەگەر به هەڵەدا نەچووبم، یادگە دەپارێزێت. هەڵبەت یادگەی

من نا، بەڵکوو یادگەی نەوەکانمان. یادگەیەك بۆ ئیبراهیمی جێ دێڵم، تاکوو دوای من کۆیان کاتەوە، کۆیان کاتەوە و بیانخاتە پاڵ یادگەیەکی دی، یادگەی باوك و باپیرانم.

ژیان وا دێتە بەرچاو مەتەڵێکی گەورە بێت. چەندێك بکۆشم ناتوانم گرێکانی بکەمەوە، یاخود پێیان بگەم. دیمەنی ڕاگوێزان، دەرکردن، ئاوارەبوون، تاکوو ئێستا دیمەنی هەموو ژیانمە. ئەو خاڵەی بە دەوریدا دەخولێمەوە. ئەوی لە دوای ئەوەوە دێت پشتی پێ دەبەستێت. هەموو ئەوانەی لە دوایەوە دێن بێ ئەو ناکرێت لێی تێبگەیت. ژیانمان لە تەتوان تەنیا چەند ئەڵقەیەکی درێژکراوە بوو لە هەمان زنجیرەدا. ئەڵقەگەلێك دەکرێت لە دیمەنی کارمندا کورت بکرێتەوە نوقومی فرمێسك بووبێت. لە دیمەنی من و باوکم بە درێژایی ساڵانێکی زۆر. بە تەنیا لە کەناری دەریاکە دادەنیشین، لە بەری ئەوبەرمان دەڕوانی. لە نێوان ئێمە و زەوییەکەماندا چەند کیلۆمەترێکی کەمە. لە نێوان ئێمە و باپیرانماندا تەنیا پەڕینەوەی دەریایە. لێ پەڕینەوەی دەریا بووەتە ئەستەم. وەکوو هەوڵێك بۆ ژیانکردن لەگەڵ ئێستادا، ماڵەکانمان لەسەر شێوازی ئەندەلووسی بنیات نا، تاقە بیناسازییەك ناسیێتمان و چاومان لەسەری ڕاهاتبێت. پێوەستبوونمان بە زمانەکەمانەوە چارەسەرێکی سەرکەوتوو نەبوو، کەچی تاقە ئومێدمان بوو. ئومێد و تواناشمان. باوکم بەر لەوەی فێری زمانی عەرەبی ببێت، مرد. ئەو هەموو ساڵانەی لێرەدا ژیا زمانیان نەگۆڕی. باوەڕیان نەگۆڕی. ئەو قەناعەتەی زەوی هی هەمووانە، ئایین پرسێکی کەسێنییە، نەگۆڕی. من و باوکم لێرە بە دوو ئایینی جیاواز ژیاین. ئەو بە کرستیانی و منیش وەکوو موسوڵمان مامەوە لەو دەمی لەگەڵ ڕاگوێزاندا ئەو بڕیارەم دا.

لەبەر ئەوەی کرستیانبوونەکەی سۆفیگەری بوو و ئیسلامییەتییەکەی منیش هەر سۆفیگەری بوو، لە زەوییەکی بەپیتدا یەکترمان دەبینی.

# 83

| | |
|---|---|
| يا جامع الشمل بعدما افترقـــا | قــدر لعينـــي بمـــن احـــب لقـــا |
| ويا مجير المحب من فرق ال | ــــفراق عجـل واذهــب الفرقـــا |
| عاف مـن السقم مبتلى بهوى | مــا نفعــت فيــه عــوذة ورقـــى |
| اجر بوصـل الحبيب قلبي مـن | طــوارق الهجـر وافـتح الطرقـــا |
| ولا تسـلط اذى الفــراق علــى | ضعفي فما لي على الفـراق بقـا |
| ولا تؤاخـــذ فلســـت اول مـــن | بخيس عهـد الحسـان قـد وثقـا |
| انـــا الـــذي رام مـــن احبتـــه | حـــــظا بلقياهــــم فمـا رزقـــا[1] |

**(ابن سهل الاندلسي)**

---

[1] لەبەر زەحمەتیی وەرگێڕانی چامەکە، لێرەدا هەوڵ دەدەم مانا و مەبەستەکەی ڕوون بکەمەوە:

ئەی ئەوی کەسەکان دوای دابڕانیان یەك دەخات، لەوی خۆشم دەوێت نزیکم بکەوە. ئەی بەهاناهاتوو، بۆ ئەوەی دانەبڕێین خێرا بە یەکدیمان بگەیەنە. ئاشق نەخۆش نییە، بەڵکوو گیرۆدەی خۆشەویستییە. نزا دەکات لە خۆشەویستەکەی جیا نەبێتەوە، چونکە جیابوونەوە مردنێتی. دەپاڕێتەوە لەبەر خۆشەویستی لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەکات، خۆ ئەو یەکەمین کەس نییە ئاشقی جوانان دەبێت. تەنیا ئاواتی گەیشتنە بە دڵدارەکەی، بەڵام ئەوە زۆر دوورە و نایەتە دی. (وەرگێڕ)

# 84

**له کاغەزەکانی کارمن دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٦٣٨**

## (1)

بەیانیانێکیان، پێش ساڵانێکی زۆر، ڕوخساری دزێوی خۆمم له ئاوێنەدا بینی. دایکم پێی گوتم: برۆ درێژەکانت بە مقەست هەڵپاچە. گوتی: قژە لوولەکەت بۆ دواوە شانە بکە. گوتی: ددانەکانت بشۆ. دایکم گوتی: له ئاوێنەکە بڕوانە. لێ دایکم پێی نەگوتم چۆن ئەو ناشرینییە لەسەر ڕوخسارم هەڵگرم. پێی نەگوتم چۆن بتوانم ئەوانی دی ناچار بکەم لە سیمام بڕوانن. دایکم پێی ڕانەگەیاندم بۆچی خەڵك خۆیان لە نیگاکانم دوور دەگرن. ئەو نیگایانەی لە ئاوێنەدا بینیمن. نیگا ترسناکەکانم.

ئەو نیگایانەی حەبیبی نابینا گوتی ترسناکن. حەبیب تاقە کەسە وێڕای نابینایییەکەی نیگاکانم پێی گەیشتن.

## (2)

لە ئاوێنەکەدا برۆ پانەکانی خۆم چەشنی سەیوان بینین. وەکوو سەیوانێك دزێوییەکە دەشارێتەوە و هەوڵ دەدات بێهوودە دڵنەوایی بکات. لەژێر سەیوانە پانوپۆڕەکەوە چاوەکان دیار بوون. بە بێلایەنی تەماشای گشت ڕێگەکانیان دەکرد و لە ڕوخسارێکی ناشرین دەگەڕان.

دایکم گوتی: پەروەردگار لە وێنەت ناڕوانێت. گوتی: تەماشای ڕۆحت دەکات. گوتی: جوانی، جوانیی دڵە. دایکم وای پێ گوتم، هەرچەندە زانیارییەکەم سوودی نییە. دەبوو دایکم وا بە تەماشاکەران بڵێت. بەوانە بڵێت خۆیان لە سەیرکردنم دەپاراست. دەبوو بەخشش بە نەداران بدات. قسەکانی دایکم هیچیان نەگۆڕی. هیچیان لە واقیع نەگۆڕی. هیچیان لە خەونەکان نەگۆڕی. خەونە مۆتەکەییەکان.

## 85

**له كاغەزەكانی میگێل دی مۆلینا**

**تەتوان/ ١٦٥٣**

**سەبارەت ناشتنی باوكم له قەڵای خۆلین ١٦٤١**

**(2)**

دوا ڕاسپاردەی باوكم ئەوە بوو له كوینكا بنێژرێت. لەو جێگەیەی به زیندوویی وەدەرنراین ویستی به مردوویی بگەڕێتەوە. لەبەر ئەوەی ڕاسپاردە بوو، ڕاسپاردەش قەرزە، ئەو سەركێشییەم كرد. (دەبوو چەند سەركێشیی ترمان بكردبایا و نەمانكرد؟ چەند جار دەستەوستان بووین له بەهاناهاتنی زیندووان بۆ ڕازیكردنی مردووان!) فێڵەكە وابوو تابووتەكەی باوكم لەگەڵ بازرگانیی دەریایی دەربچێت. زۆر بیرم له سزایەك نەكردووەتەوە دەكرێت تووشی بازرگانێك بێت مردوویەك بە قاچاغ دەربكات (ئایا پێشتر ڕووی داوە یەكێك ناچاری ئەوە بوو‌بێت مردوویەك بشارێتەوە؟ ئاخۆ پێشتر ڕووی داوە مردوو كۆچی كردبێت، تاكوو له سەرزەمینێكی تر بحەسێتەوە؟ جیاوازیی چییه له نێوان ئێسكوپرووسكت لێرە بنێژرێت، یاخود لەوێ؟!)

نەمزانی ئاخۆ فەرمانی ڕاگوێزان دەرکردنی مردووان دەگرێتەوە، یاخود تەنیا تایبەتە بە زیندووان؟ وەکوو یاریدەدەرێك بە نیگەرانییەوە لەگەڵ کابرای بازرگان بە ڕێ کەوتم. وەکوو پاسەوانی نهێنیی جەستەیەك ژیانی جێ هێشتبێت. وا دیار بوو کارەکە پتر لە پەڕینەوەی دەربەندێك بوو، لە بەری ئەوبەریشەوە گواستنەوە بە گالیسکە زەحمەت دەبێت. ئاوای دیار دەدا. لێ لەوەش خراپتر گواستنەوەیە بە تەرمی باوکتەوە. بە تەرمی باوکتەوە ڕێ بکەیت واتە بە مێژووی پشتاوپشتت ڕێ بکەیت، ئایندەت وەکوو ڕابردوو بەکێش بکەیت. هەڵگرتنی تەرمی باوکم مانای ڕۆژئاوابوونی لەگەڵ شنەی بەیاندا کورت کردەوە. ڕۆیشتن و هاتنەوەی لە ساتێکدا کورتکردەوە. تەرمی باوکم تەرمێکی ئاسایی نەبوو. بێ خوازە بەرجەستەکردنی چارەنووسێك بوو لە دووریی چەند بستێکەوە چاوەڕوانم بوو، یاخود چارەنووسێك نزیکتر لە خوێنهێنی مل لێمەوە.

لە کەشتییەکەدا، لە نێوان کوتاڵە بەسەریەکداخراوەکان لە سندووقی گەورەدا، تابووتەکەی باوکم وەکوو تابووتێك گوناهێکی کردبێت، بە شەرمەوە هاتبووەوە یەك. لە کاتێکدا دەریاوانان و یاریدەدەرەکانیان شەوێ پێکەوە قسانیان دەکرد، من بە تاقی تەنێ بە تەنیشت باوکمەوە دانیشتبووم، جار ناجارێکیش یارۆی بازرگان نیگای دڵنەوایی تێ دەگرتم. لە ساتێکدا تێبینیی ئەوەم کرد ئەو سندووقەی دوا ئامێزی لە باوکم داوە، نموونەی بچووککراوەی سندووقەکانی ترە. لێ جۆری شتوومەکەکان جیاوازە. دایکم بە هەمان نیگای ماڵئاوایی لێ کردین، لە ئاسۆوە دەرکەوت، بەدەستی ئاماژەی سڵاوی کرد و ون بوو. لە کاتێکدا کارمن وەك پێشووی بچووك بوو، پێیەکانی

تەکەتەکیان بوو بەسەر پەڵەهەورێکی کۆچەرییەوە شۆڕ بووبوونەوە و ڕایدەژەندن.

لە ڕێگەی وشکانی باران لێی نەکردەوە. یارۆی گالیسکەوان، ئیدی لەبەر ڕەشبەختی، یاخود گەشبەختی بووبێت بە هەمان ئاقاری ئاوارەکردندا تێپەڕی. چاوانم وەکوو یادەوەرییەکی هەتاهەتایی بەرزاییە سەوزپۆشەکانیان پاراست، هەروەها ئەو شەقامانەی لەسەر گردەکان لێ درابوون، لەگەڵ دەرگە کەوانەییەکانی ماڵان.

لەو مزگەوتانە ڕامام کرابوونە کڵێسا و خاچیان بەسەرەوە بوون. ئینجاش شوێنەکە بۆنی ئێمەی لێ دەهات. جێپەنجەمان بە خانووەکانەوە دیار بوو. بۆن و جێپەنجە. بۆنی باوکم و جێپەنجەی محەمەد دی مۆلینا. بۆنی تێکەڵبووی دایکم بە بۆنی باوکم. هەروەها جێپەنجەی تەواوەی مۆلینا لە جێپەنجەی خانەوادەی ئیرناندیسدا. بۆن و مۆرکی ئەندەلووسییەکان. ساتەیلی تیژتێپەڕ و ماوە، درەختێك ڕەگەکانی لە زەویدا دیار نین و لقەکانی وشك و گەڵاکانی زەردن.

بیرم لە مانوێل و خوانا و کارمن کردەوە، لەپڕ فرمێسکێك دزەی کرد. ئێستا باوکم لە سندووقێك بوو چاوەڕێی دوا مەنزڵ دەکات. من و براکانیشم لە سندووقی ترداماینەوە. لە غەڕناتە حەواینەوە. لە بەردەم کۆشکی سوور هەندێك ئاومان خواردەوە. کۆشکی گۆڕین لەسەر گردە بڵندەکەیەوە لێمانی دەڕوانی. منیش لە بنارەوە ملم بۆ پێشەوە وەرسووڕاند، تاکوو لە دیوارەکانی ڕابمێنم. وەك پیرێکی نەخۆش هاتە بەرچاوم. دەتگوت زەلامێکە جلی ئافرەتانی لەبەرە، تاکوو دیار نەبێت.

پاشان گەیشتینە جەییان. لە جەییان یارۆی گالیسکەوان هاواری کرد: "ئەسپەکان بە کەیفی دڵی خۆیان ڕێ دەکەن". کابرای گالیسکەوان شیڕاندی: "ئەسپەکان غەزڵیون". من لادانی ئەسپەکانم دەبینی و لێیان ڕامابووم. حەزی یارۆی گالیسکەوان بۆ بەرزەفتکردنیان لاملییەکەیانی پتر دەکرد.

جڵەوت بە دەستەوە بێت مانای ئەوە نییە حوکم بەسەر ڕۆحەکاندا دەکەیت. چەندێك جڵەو شل بکەیت ئەوەندە دەسەڵاتت زیاتر دەبێت، بە گالیسکەوانم گوت: "بە دڵی ئەسپەکان بکە". پاشان لێم پرسی: "ئەگەر دوای حەزی ئەوان بکەوین، ئاخۆ دەگەینە کوێ؟"، "دەگەینە قەڵای خۆڵین گەورەم، قەڵای خۆڵین".

بە سەرم ئاماژەم کرد و بە دەستیشم ڕەزامەندیم ڕاگەیاند. زانیم هەرچەند بە گومانەوە بوو، دڵمان بە دڵی ئاژەڵانەوە پێوەستە. ئەوان لە ئێمە باشتر دەزانن ئەگەر شتەکە پێوەندیی بە غەیبەوە هەبێت.

ئاخۆ وەڵامم بە داخوازیی ئەسپەکان دایەوە، یاخۆ بە حەزی خۆم کە دەتگوت جێبرینێکی کۆنە؟ یان بۆ داواکردنی یارمەتی؟ بۆ یارمەتی یاخود بۆ دڵدانەوە؟ ئاخۆ لەو ساتەدا شتێکم زیاتر لە بەپشتدانی دەستێکی نزیك دەویست؟ دەستێك خوێنی من بە دەمارەکانیدا ڕێ بکات؟ جەییان ناوە عەرەبییەکەی خئاینە، جەییان چەند ڕیانی کاروانەکانە. جەییان چەند ڕیان بوو بۆ ئێمە.

یارۆی گالیسکەوان فەرمانەکەمی وەکوو تینوویەك قۆستەوە. وام زانی هۆکارەکەی نزیکیی مەودا و خێراییی حەسانەوەیە.

کەچی سەیرم هاتێ گالیسکەوان خەڵکی قەلای خۆلین بوو. گوندەکەی وا وەسف کرد وەك ئەوەی شارەزای بم، لەسەر ترقەی سمی ئەسپەکان سترانی دێهاتیی بۆ چڕیم، وای دەزانی من دەیانزانم. یارۆی گالیسکەوان نەیدەزانی سندووقەکە مردوویەکی تێدایە. نەیدەزانی مردووەکە بە بیستنی ئەو گۆرانییانە لە شەقەی باڵ دەدات.

# 86

**له کاغەزەکانی میگێل دی مۆلینا**

**تەتوان/ ١٦٥٣**

**هەمبەر ناشتنی باوکم لە قەڵای خۆلین ١٦٤١**

(3)

لە گالیسکەکەوە سەرمکێشا داروپەردووی قەڵایەکی ئەندەلوسیم بینی بە تەنیشتییەوە قەڵایەکی دی لێ بوو فرناندۆی سێیەم بنیاتی نابوو، پاشان کاتدرایییەیەك دەرکەوت لە قۆناغی دروستکردندا بوو. گالیسکەوان گوتی: ئەوە سەت ساڵە خەریکی بنیاتنانین کەچی هێشتا تەواویان نەکردووە. لە شەقامەیلێك شارەزایان بووم بەسەر هەندێك گەرماوی عەرەبیدا تێپەڕیین کابرای پەنجا ساڵان بە پرسیارێك ئاماژەی پێ دا: "گەرماوی عەرەبی، ئایا پێشتر سەردانت کردووە؟" کابرا ئیسپانی بوو، هەر بە ئیسپانییش دەئاخاوت، منیش، ئایا دەکرێت پێی بێژم من خەڵکی ئەندەلووسم؟ ئەی نابێت ئەویش وەك من ئەندەلووسی بێت؟ ئەندەلووسییەك مێژووی باپیرانی نازانێت، یاخود پشتگوێی دەخات؟ بە هەمان زمان قسانمان دەکرد، بە

هەمان ئاماژە، هەمان ئەدگاریشمان هەبوو. لی ئەوەندەی هەیە یەکمان مایەوە و ئەوی تریش دەرکرا.

لەو ڕێگە هەورازەی دەچووەوە سەر قەڵای خۆلین، ناچار بووم بە دڵێکی ترساو لە کەوتنی تابوتەکە لە گالیسکەکە دابەزم، هەرچەندە بە گوریس شەتەك درابوو، لە دواوە ڕۆیشتم بە هەردوو دەستم تەرمەکەم گرتبوو. هەرچەندە تەختەمان لە نێواندا بوو، لێ دڵی لەژێر لەپمدا لێی دەدا. گردە بەرزە ماندووکەرەکە. تەرمی باوکم. ئەو دڵۆپە بارانانەی بوونە بەشێك لە دیمەنەکە. ماڵە بچووکە بڵندەکان و ئەو باخە زەیتوونانەی بە شێوەیەکی هەتاهەتایی لە ئاسۆدا درێژ بووبوونەوە. هەموو ئەمانە ساڵانێکی زۆریان دەگەیاند بەسەر چوون، ساڵانێکی زۆری داهاتوو. منیش، وێڕای لاوازی و کەمئەزموونیم، لە نیوەیدام. وەکوو یەکێك لێی دەڕوانم بزانێت ئەوی ڕابورد دێت، ئەویشی دێت تەنیا دووبارەبوونەوەی ڕابردووە. ئاینده مێژووە، مێژووش ئاییندەیە. منیش دوو جاران واقیع دەبینم، جارێك لە ڕاستیدا جارێکیش لە ئاوێنەدا.

بەپێی ئارەزووی هەردوو ئەسپ گەیشتینە گۆڕەپانی قەڵای خۆلین. لەوێ گالیسکەکە لەژێر سێبەری درەختێکی گەورەدا وێستا. درەختێك دیارە هێندەی گوندەکە کۆنە. کاتێك دابەزیم و لە ڕەگەکانی نزیك بوومەوە، تێبینیی هەندێك پیتی عەرەبیم کرد. هەینێ لە تیپە هەڵکۆڵراوەکان ورد بوومەوە، "دی مۆلینا بۆ هەمیشە"م خوێندەوە.

کابرای گالیسکەوان بە پارچەنانێکی پڕ لە پەنیر بیرڕۆییەکەمی بڕی. لێی پرسیم داخۆ عەرەبی دەزانم. "بەڵێ". ئەوجا بە دەستی ئاماژەی بۆ باڵەخانە دوو نهۆمییەکان کرد،

گوتی "خانەوادەیەکی مۆریسکی لێرەدا دەژی". خانەوادەی دی مۆلینا؟"، "بەڵێ، دەیانناسی؟".

هێشتانەکینێ ئاسمان پرووشەی دەکرد. لەو دەمەدا زانیم وەستان لەژێر درەختدا ئاکامەکەی توندترە لە وەستان لەژێر باراندا. لەژێر درەختەکەدا ئاوەکە تێکەڵ بە تۆزی سەر گەڵاکانەوە دەڕژێتە سەرمان. کیژۆڵەیەك لە بانیژەیەکی بچووکەوە سەری دەرهێنا. گالیسکەوان بە دەستی ئاماژەیەکی بۆ کرد و ون بوو. "ئەم کیژۆڵەیە لە خانەوادەی دی مۆلینایە"، بەدەم زەردەخەنەوە وەك ئەوەی خەونی کۆنە برادەرێکی بەدی هێنابێت، وای گوت.

# 87

**کارمن دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٦٣٨**

(3)

لەو نێـــوەدا، ڕێـــگەکەم بە ڕوخســـار نەخشـــێنرابوو. ڕوخسارەیلێك بە قەبارەی ناولەپم. چەندێك هەنگاوێك دەچوومە پێشێ، پێم لە ڕوخسارێك دەنا، چەنـدێکیش بگەڕامـایەتە دواوە، دوو جاران پێم لە ڕوخسارەکە دەنا. دایکم گوتی: ئەمە سووڕی ژیانە. گوتی: بەسەر ڕوخسـارەکاندا ڕێ دەکەیـن. دەچینـە سـەر کەپووەکـان. قـامکی دۆشاومژە لە چاوەکـان تونـد دەکەیـن. بە لایەکـی پێمـان لەسـەر گوێچکەکـان دادەنێـین. گـوتی: پاشـان زارەکان هەڵماندەلووشـن. جارێـك لە ڕێخـۆڵەدا جێگیـر دەبـین. دایکم گوتی: پاشان بەرەو هیچ دەڕۆیـن. گـوتی: دەبینـە نەبـوو. دایکـم باسـی داپیـرەی بـۆ کـردم. داپیـرە نابینـابوو. منـداڵێکی چاوساغی بوو. منداڵەکە ئارەزووی ڕەنگکردنـی دەکـرد. حەزی لێ بوو نیگاری ڕووبار بکێشێت. نیگاری گردەکان. نیگاری ماڵە

بچووکەکـان. نیگـاری پشـیلە. نیگـاری ملپەڕێنەکـان. نیگـاری درەختەکان. هەروەها حەزی لە نەخشاندنی نیگاری دایك بوو لە هیچ بڕوانێت. بە دوو چاوی بێئاگاوە. دوو چاو چەندێك بکۆشن ببینن نابینن.

## (4)

ڕێگە درێژەکان، چەندێك درێژبن، بە ڕۆیشتن لەسەری تەواو دەبن. بێگومان وا دەڵێن. وا دەزانن ڕێگەکان ستوونی یان ئاسۆیین. من لەبەر زۆریی گەڕان بەدوای باوکمدا دەزانم ڕێگە درێژەکان بازنەیین. دەزانم ئەوی ڕووی دا ڕوو دەدات. ئەوی ڕوو دەدات هەر ڕوو دەدات. ئەوی دواتر ڕوو دەدات ڕەنگە ڕووی دابێت. دایکم گوتی: مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە. گوتی: هیچ شتێکی نوێ لەژێر خۆردا نییە. گوتی: نە دەکرێت لێرە دەرچیت نەیش بگەیتە ئەوێ. دایکم گوتی: ڕۆیشتن بەسەر ڕێگەدا گەیشتن حەتمی دەکات. بەڵام ڕوخسارە دزێوەکەم ناگۆڕێت. دایکم نەیگوت دەگۆڕێت. نەیگوت هەرچەندە دەزانێت. دەزانێ و نازانێت.

## 89

دایکم جارێك بە ئاماژە و جارێکیش بە درکاندن، دەیویست ڕوو لە قەڵای خۆڵین بکەم. ڕازی نەمانەوەی لە کوینکام نەزانی، هەروەها نهێنیی ئارەزووی لەوەی کۆچ بۆ شوێنێکی تر بکەم. شوێنێکی تر باوکمی لێ نەبێت؟ ئەو باوکەی ئێستا لە ژێرزەمینی ماڵە کۆنەکەماندا لەگەڵمدا پیاسە دەکات و لە پشتمەوە بە ڕووی زەردهەڵگەڕاویەوە لە دەستنووسەکانی باپیران دەڕوانێت. باوکم لێرە لە کوینکا بینیم، پتر لەوەی لە ڕۆژانی دواییدا ببینم.

بە حەزی مانەوە کۆچم کرد. ماڵئاواییم لە دەستنووسەکانی باپیرانم کرد بە بەڵێنی گەڕانەوە. لەگەڵ بەڵێن بە گەڕانەوە سەرجەم دەرگەکانم داخستن. کاتێك دەرگەی ماڵم کلۆم کرد، باوکم تەماشایەکی دواوەی کرد، چون ناوبڕێکی دارین لە یەکدیمان جیا نەکاتەوە. چون ناوبڕێکی زەمەنی لێکمان جیا نەکاتەوە. لەبەر حەزی مانەوە لە شوێنی خۆم مەییم، کەچی ئەو بزەیەکی کرد و دەستی ڕاستی بۆ سلاو بەرز کردەوە. لە گەشتە درێژەکەدا لە کوینکاوە بۆ مەدرید و لە مەدریدەوە بۆ خئاین، پاشان بۆ قەڵای خۆڵین، هەستم بە ئینتیما کرد بۆ ئەم خاکە. نەك ئینتیما بۆ قسەی درۆ، بەڵکوو بۆ کۆنی شاردراوە. هەندێك جار، وەکوو ئێستا، جوانیی بەسەرچوو تازەترە لە جوانیی ساوا. تەوێڵی چرچ، هێڵە لۆچەکانی ڕوومەت، جووت هێڵی دەوری لووت،

چاڵەکانی ڕوومەت کە بوونەتە چاڵی خڕ، ئەو ڕێگایانەی جوانیی ساوا پێیاندا تێدەپەڕێت، ئەو زەوییەیە بەرگەی بناغەکانی ماڵە کۆنکریتییەکان و تیکمەکان و دزێوی دەگرێت.

بەو گردەی قەڵای خۆڵینی لەسەر بنیات نراوە سەر کەوتم، لەژێر سێبەری درەختێکی گەورەدا حەسامەوە. تا چاو بڕ بکات باخی زەیتوون بوو، شتێکی بە گوێدا چرپاندم نەمبیست، بەڵام هەستی کلۆڵیی لا ڕوواندم. لە ساتێکدا هەستم بە گومڕایی کرد، دایکم لە بانیژەکەوە سەری دەرهێنا و دەستی بۆ درێژ کردم. لە کاتێکدا من نزیك دەبوومەوە، تێبینیی ئەوەم کرد خانووەکان لەوانی کوینکا دەچن؛ کورت، دەرگەکانیان کۆن و گەورە، کەوانەیی، بانیژەکانیان بچووك. ڕێگەکەم بڕی، دەرگەکە کرایەوە. لە دواوەی ڕوخسارێك دەرکەوت لە من دەچوو.

## 90

- پێمان گەیشتووە ئێوە مەڕ وەکوو قوربانی سەر دەبڕن؟
- نا، ئێمە مەڕ سەر نابڕین.
- باشە بۆچی مەڕ سەرنابڕن؟
- چونکە ئێمە گۆشتی مەڕ ناخۆین.
- ئەی گۆشتی بەراز دەخۆن؟
- نا، نا گۆشتی بەرازیش ناخۆین.
- ئەی بۆ گۆشتی بەراز ناخۆن؟
- چونکە ئێمە گۆشت ناخۆین، ئێمە ڕووەکیین.
- دوا جار کەی بوو گۆشتی بەرازتان خوارد؟
- ئێمە گۆشتی بەراز ناخۆین.
- بۆیە نایخۆن پێتان حەرامە، وایە؟
- نا، گۆشتی بەراز ناخۆین لەبەر ئەوەی ڕووەکیین.
- شایەدتان هەیە گۆشتی بەراز ناخۆن چونکە ڕووەکین؟
- ئایا تۆش شایەدت هەیە ئێمە بۆیە نایخۆین چونکە حەرامە؟

- ئەرکی من ئەوەیە پرسیار بکەم، ڕۆڵی تۆ ئەوەیە وەڵام بدەیتەوە!

- بەڵگە لای ئەوەیە داوا دەکات.

- تۆ تۆمەتباری بە موسوڵمانبوون بە نهێنی.

- ئەی بەڵگە؟

- ئەوەیە، تۆ گۆشتی بەراز ناخۆیت.

- تۆمەتەکە مایەی پێکەنینە.

- کەواتە تۆ دانی پێدا دەنێیت موسوڵمانیت؟

- من دانی پێدا دەنێم ڕووەکییم. دانیشی پێدا دەنێم پرسیارەکەت مایەی شەرمە.

- بە بۆنەی ئەم شەرمەوە دەسووتێنرێیت ئەی خوانەناس.

**(لە دادگایی کارمن دی مۆلیناوە، کوینکا ١٦٤١)**

# 91

"باڵندەی تامەزرۆی دەنکەگەنم لە سەربانە، باڵەکانی لێك کردوونەتەوە، بەڵام بەداوەوە بووە."

**(مەسنەوی/ ڕۆمی)**

# 92

**کارمن دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٦٣٨**

(5)

له ڕێگه بیرەیلی وشکم بینین، چەندێك تەماشای تاریکییەکەیم بکردایا، ڕوخساری خۆمم دەبینی. چاوە دەرپۆقیوە تۆقێنەرەکانم کە چاوەڕێی بەزەییان دەکرد، سەرنجی سەرێیان دەدا، لە کاتێکدا بە ترسێکی زۆرترەوە لە سەرەوە لە چاوانمم دەڕوانی، وەك ترسی یەکێك پشیلەیەکی ڕەش بە دوو چاوی سەوزەوە لە تاریکیدا ببینێت.

## (6)

داپیره نابیناکەم هیچی هەمبەر کوێرییەکەی بە منداڵەکەی نەگوت. قسەی گونجاوی بۆ ڕاڤەکردنی نابیناییەکەی نەبینییەوە. بەیانیانێکیان، بەیانیانێکی باراناوی و سارد، منداڵەکە بڕیاری دا لێی بڕوانێت. بە قەڵەمی ڕەش لێی نزیك بووەوە. گوتی: نەجووڵێی دایکە. گوتی: دایکە تەواو چاوت بکەوە. گوتی: چاوانت ڕەنگ دەکەم دایکە. گوتی: ئەو چاوانەت کە خوا بیری چووە ڕەنگیان بکات. ئیدی قەڵەمەکەی بە چاویدا کرد. قەڵەمەکەی بردە ژوورەوە و دوو بازنەی بچووکی کێشا. دوو بازنە پەروەردگار دەیتوانی بە قامکی تووتەی بیانکات، بەڵام نەیکرد.

## 93

ئەی ئەوی خۆشیویست و منی دەسخەڕۆ کرد...

**بە دەنگی شێخ محەمەد عومران**

## 94

**له كاغەزەكانی میگێل دی مۆلینا**

**قەڵای خۆڵین/ ١٦٤١**

**(4)**

ئەو كیژۆڵەیەی ون بوو لای دەرگەی ماڵ دەركەوتەوە و لێی ڕوانیم. چاوە فستقی و دەموچاوی خڕی كارمنیان بیر هێنامەوە. بەرەوڕووی چووم و ماچم كرد، لە پشتییەوە زەلامێكی چل ساڵان دەركەوت، تەواو لە من دەچوو.

لویسی ئامۆزام دڵی دامەوە، پاشان خانەوادەكە كۆ بوونەوە، بۆیە خڕ بوونەوە گوایا هیچ ڕێگەیەك بۆ ناشتن لە قەڵای خۆڵین نییە. ڕاستییەكەی من دوودڵ بووم، بیرم لەوە كردەوە ڕاسپاردە قەرزە، منیش ئەم هەموو مەودایەم بۆ وەفاداریی ئەو بڕیوە. بەڵام وامان لێكدایەوە چاوەڕوانی، تەنانەت گەیشتن بە كوینكا بۆ مردووەكە ڕیسواییە، ناشتنیش لە ئامێزی قەڵای خۆڵین، وەكوو لویس گوتەنی، وەكوو ناشتنە لە كوینكا. ئا لێرەدا مامان لەگەڵ براكانیدا دەنێژرێن، گلەیی لێ كردم.

مەزەندەم كرد گوێم لە گوزارشتی "پێویست ناكات ڕاسپاردەكە بە ڕووكەشییەكەی وەربگریت، بەڵكوو بە

ئامانجەکەی" بێ ئەوەی بزانم کێ ئەمەی درکاند، ئاخۆ یەکێك لەوانی ئەوێ گوتی، یاخود بە خەیاڵمدا هات. کاتێك ڕازی بووم، ساتی بێدەنگی دایگرتین. نیگایان لە نێوان خۆیاندا گۆڕییەوە، لە کاتێکدا من لە ڕوو دامام. ئەو دەمی پرسیارە سەرسوڕهێنەکەم لە چاویاندا خوێندەوە، پێم ڕاگەیاندن نوێژ لە کڵێسا دەبێت و ناشتنەکەش لە گۆڕستانی کاسۆلیکان، ئیدی ئاهێکیان پێدا هاتەوە.

لەگەڵ خۆرئاوابووندا، ئاوابوونی یەکجارەکیی باوکم بوو. بۆ دواجار نیگام کرد و بە دڵێکی پڕ گریانەوەماڵئاواییم لێ کرد.

# 95

**کارمن دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٦٤٠**

## (7)

داپیرە نابیناکەم بە بێدەنگی بەرگەی گرت. بەرگەی ئازاری گەورەی گرت، تاکوو ئومێد بە منداڵەکەی ببەخشێت. پاش ئەوەی منداڵەکە تەواو بوو و بەدەم بزەخەنەوە دانیشت، دایکە بێ ویستی خۆی فرمێسك بە چاوانیدا هاتە خوارێ. لەو دەمەدا دوو بازنە ڕەشەکە کەوتنە سەر ڕوومەتی. ئیدی وەکوو دایکم گێڕایەوە، منداڵەکە ڕابوو و ئامێزی لێ دا. بە ناولەپی کوڵمەکانی سڕینەوە. منداڵەکە نیگاری ڕوخساری خڕی دایکەی کێشا. نیگاری برۆ ڕەشە درێژەکانی کێشا. نیگاری دەمی کێشا بە دوو لێوی کراوەوە. نیگاری لووتە بچووکەکەی و قژە ڕەشەکەی بە پەرچەمە قاوەییەکانییەوە. دوای ئەوەی نیگاری چاوانی کێشا، یەکیان سپی و ئەوی دی سپی، بە ڕەشی ڕەنگ کردن. دایکە نەیدەزانی کوڕە لەو کاتەوە لە چاوانی نەڕوانی. کوڕە وێنە کێشراوەکەی هەڵبژارد. وێنە کێشراوەکە لێی دەڕوانی. کوڕە هەستی بە هیچ گوناهێك نەکرد. چاوانی دایکم

سپین، لەگەڵ خۆیدا وای دەگوت. وای دەگوت بێ ئەوەی بزانێت دوو چاوی سپی نابینایی دەگەیەنن. وای دەزانی تەنیا دوو چاوە سپییەکە لێی نارِوانن.

(8)

به بیرەکانی سەر ڕێگە دەڵێن چاڵ، منیش ناوم ناون بیرە وشکەکان. ناوێرن لێیان نزیك ببنەوە، حەز دەکەم دابەزمە ناویانەوە و تێیاندا ڕێ بکەم. دەکرێت بە بازدان بچیتە ناو گشت بیرەکانەوە، ڕێکردن بە گێڕی بەشێکی ڕەسەنی چیرۆکەکەیە، بە ڕیتمێك جیاواز لە ڕێکردنی ئەوانی سەرەوە. بیرهەڵکەنان دێن و دەچن وەك ئەوەی بەسەر شووشەدا بجووڵێن. دەزانم، چونکە ڕاهاتووم، بیرەکان بە یەکدییەوە بەستراون، ڕووبەریان یەکسانە، یاخود زیاترە لەسەر ڕووی زەوی، گواستنەوە لە بیرێکەوە بۆ بیرێکی دی لە ڕێگەی بەرزاییەکانەوە دەبێت، بەڵێننامەکەش دەڵێت چەندێك ئەم بیر و ئەو بیر بکەیت، دەبێت بەردەکان لەسەر پشت هەڵبگریت. حەتمەن وەك مێروولەیەکت لێ دێت هەموو جۆرە بەردێك هەڵدەگرێت. حەتمەن بۆ ئومێد، واتە گەیشتن بە دوا بیر، ئەوە دەگەیەنێت، تۆ سەرلەنوێ دەست پێ دەکەیتەوە.

# 96

براکەم بوو. کاتێك دەرگە کرایەوە، دەرگەی ماڵی دایکم لە قەڵای خۆڵین، خۆم لە ئاوێنەکەدا بینییەوە. لە یەکەمین ساتدا وام زانی لەپشت دەرگەکەوە، نەك بە تەنیشتییەوە، ئاوێنەیەکیان بۆ ژوورەوە داناوە. خۆم بە درێژی و لاوازییەکەمەوە بینی. بە قژی ڕەش و تێکچڕژاو و درێژیەوە. بە چاوە خڕەکانییەوە. لەو ساتەدا بیرم لەوە کردەوە، وا باشترە دەستم بە قژمدا بێنم، کاتێك ئەوەم کرد تێبینیم کرد. لە ئاوێنەکە دەستم بەرز نەبووەوە، بەڵکوو ڕوخسارم بزەی هاتێ و دوو دەست کرانەوە باوشم لێ بدەن، گوێم لە دایکم بوو لەودیو ئاوێنەکەوە بێ ئەوەی دیار بێت پێم دەڵێت، ئەوە جمکانەکەتە. کاتێك لە هۆش خۆم چووبووم، باوکمم بینی منی خستووەتە سەر شانی بە شەقامەکانی کوینکادا دەسووڕێتەوە، کەچی من بەسەر شانی باوکمەوە تەماشای خۆمم دەکرد و لە بانیژەی ماڵمانەوە ئاماژەم بۆ خۆم دەکرد و قسەگەلێکم هەڵدەبزرکاند هیچم بیر نییە. ئایا ئەوە براکەم بوو بەسەر شانی باوکمەوە؟ یاخود ئەوی بانیژەکە بوو؟ ئەوجاری لە شەقامە سەرەولێژییەکەدا غلۆر بوومەوە، ئایا ئەوە من بووم دەستم شکا، یاخود براکەم بوو؟ ئاخۆ لە کوینکا بووین، یان لە قەڵای خۆڵین، یاخود لەو شارە دوورە بووین لێوەی هاتم؟!

دایکم گوتی ئەوە جمکەکەتە. بەر لەوەی هەناسەیەك

بخۆمەوە پێشمان کەوت بۆ ژێرزەمینێکی تر لە ژێر ماڵەکە. براکەم لەپێشمەوە بوو، بە حەزی یەکێك بوونەوەری سەیر ببینێت چاودێریم دەکرد. ئەوی خۆی ببینێت. لەو دەمی دایکم دەدوا، چاوەڕوانی وەڵامەکانی براکەم و پەرچەکردارەکانی بووم، لەوەدا لەو تاڵە نەبینراوانە دەگەڕام بەوی دەبەستمەوە.

لە ژێرزەمینە درێژ و چوارگۆشەکەدا پێچەوانەی ژێرزەمینە لاکێشەکەی کوینکا، چەند سندووقێك لە گۆشەیەکی بەریندا بوون. براکەم پێی ڕاگەیاندم ئێستا خاڵییە.

لە گۆشە و ژوورەکانی تر دەستنووسەکان دانرابوون و پارێزرابوون. دەستنوسەکانی خانەوادەی دی مۆلینا لە لقی یونس لە قەڵای خۆڵین. دەستنووسەکانی کۆچی یەکەم لە کوینکا و مانەوە دوای بە کرستیانبوونی زۆرەملێ و دادگەکانی پشکنین و شۆڕشی ئەلبوشارات و کۆچپێکردنی یەکجاری. دەستنووسەکانی مانەوە و مانۆر دوای ئەوەی مۆریسکییەکان ڕاگوێزران.

ئەرشیفی قەڵای خۆڵین لەگەڵ ئەرشیفی باوکم و ئەرشیفەکەی کوینکادا تەواو کەماڵ دەبوو. نامەکانی نێوانیان و ئەو نامانەی نەگەیشتن. ڕۆژانەکان و چیرۆك و هۆنراوە و نیگارەکان. ژیانی مرۆڤگەلێك دەرنەکران، بەڵام لە زەویی خۆیاندا دوورخراوە بوون. لە نێوان ستەم لەسەر خاکەکەت و ستەم لە زەوییەکی نامۆدا، کامیان هەڵدەبژێریت؟

# 97

**کارمن دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٦٤٠**

## (9)

ڕۆژێکیان، دایکم گوتی: وێنەی ڕوخسارت بکێشە. گوتی: هونەرمەندێك کاتێك وێنەی دنیای کێشا ئەوجا زانی وێنەی ڕوخساری خۆی کێشاوە. گوتی: ڕەنگە لە وێنەکەدا جوانییەکی شاراوە ببینیت. بۆیە منیش وێنەی ڕوخسارمم کێشا تاکوو جیهان ببینم. وێنەی جیهانیشم کێشا بەڵکوو ڕوخساری خۆم ببینم. لە کۆتاییدا بۆم دەرکەوت، هەروەکوو چۆن هەمیشە بۆم دەردەکەوت، وێنەی ڕوخساری دایکم دەکێشم. لە بەرابەر ئاوێنەکە دادەنیشتم، ورد دەبوومەوە، ئەدگارە ناشرینەکەی خۆمم لەبەر دەکرد. لێ هەر هێندەی تەماشای کاغەزم دەکرد، ڕوخساری دایکمم بیر دەهاتەوە. دایکە نابیناکەم، ئەو دایکەی بە دوو چاوی سپییەوە نابینا بوو.

جارێکیان، وەکوو دایکم مۆچیاریی کردم، بڕیارم دا

سەرلەنوێ وێنەی دنیا بکێشم. وێنەی بیر، دۆڵچەم کێشا. قاڵدرمەیەکم کێشا دەگەیشتە بنی بیرەکە، بیرەکە وشکی کردبوو. دەبوو بە شەلەشەل بەناویدا ڕێ بکەیت. لەناو بیرەکان وێنەی گردۆلکەم کێشا، وێنەی شاخ و دەشتم کێشان. وێنەی دوکانی ئاسنگەری و کێڵگەی زەیتوونم کێشا. منداڵ بووم لاسایی قسەکانی دایکمم دەکردەوە. وێنەی پەنجەرە و خانووم کێشا. وێنەی دیوارێکی ڕوونم کێشا دەکرا لێوەی تێپەڕی. وێنەی ڕۆخەکانی دوو ڕووباری بچووکم کێشا. وێنەی دوو بەلەمی بێ سەوڵم کێشا. وێنەی دوو کەشتیم بە تیر و کەوانەوە کێشا. وێنەی شەپۆلی بێ دەریام کێشا. لە کۆتاییدا وەکوو چۆن هەمیشە نیگارم دەکێشا، وێنەی ڕوخساری دایکمم کێشا. دایکە نابیناکەم، بە دوو چاوی سپییەوە.

## (10)

دایکم گوتی: هەمووی تێدەپەڕێت. گوتی: دەبێت هەمووی تێپەڕێت. تێدەپەڕێت، یاخود ون دەبێت. بەرەو شەقامەکەی بردم و گوتی: بڕوانە، ئاوەکەی ڕشتە سەر زەوییەکە. دایکە نابیناکەم گوتی: بڕوانە چۆن ئاو بە نێو کونەکاندا دەڕوات. گوتی: بڕوانە چۆن خۆی پێدا دەکات تاکوو هەڵبێت. گوتی: بڕوانە چۆن هیچ شوێنەوارێك جێ ناهێڵێت. گوتم: تەماشا دەکەم. گوتی: شتەکان ئاوا تێدەپەڕن. پاشان جارێکی دی ئاوی ڕژاندەوە. پاشان گوتی: بڕوانە. گوتم: دەڕوانم. دایکم گوتی: دەبینیت چۆن پەڵەیەکی خڕ جێ دەهێڵێت. گوتم: دەبینم. گوتی: دوای تۆزێك نامێنێت. گوتی: شتەکان ئاوا ون دەبن.

بەڵام دایکم ڕوخساری من نابینێت. ڕۆیشت بێ ئەوەی ناشرینییەکەم ببینێت. بەر لەوەی نیشانەکانی ئەشکەنجەدان لەسەر تەوێڵم ببینێت. دایکم نەیگوت هەندێك شت هەر دەمێنن. هەندێك شت کەلێن دروست دەکەن. ئەو کەلێنانەی شتەکان دروستیان کرد بەسەر ناچن. دایکم نەیدەزانی کەلێنی ڕۆیشتنی باوکم بەسەر ناچێت. کۆچی میگێل تێناپەڕێت. مەرگیشی بەسەر ناچێت. نەیدەزانی کەلێنەکان لە دڵدا قووڵن، زایەڵەیشیان لە ناوچەوان و دەوروبەری لووتدایە. نەیدەزانی ناشرینیی ون نابێت. دەموچاوم پتر کونجر کونجر بووە. چاڵەکانی دەڵێی چزووی هەنگن. چزووی هەنگ لە ناو کەلێنەکان.

چاڵەکانی ڕێگەم ناو ناوە بیر، بیری وشك دادەبەزمە ناوی و تێیدا ڕێدەکەم. لە نێویاندا تەراتێن دەکەم. لەمەوە دەچم بۆ ئەو

و شاخەیلێك بەسەر شانمەوەن، وەکوو هەر بڕوادارێکی دڵسۆز. باوەڕدارێك چەندین شاخی هەڵگرتووە، بەڵام شاخەکانی من ئاوین. شاخەکانم تاشەبەرد نین. شاخەکانم لە بازڵت و مەڕمەڕ نین. شاخەکانم، ئەوانی بەسەر شانمەوەن، شاخەیلی شلن. شل وەك جیوە. شل وەك ئاو. شل وەك خوێن.

## 98

**کارمن دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٦٤١**

**(11)**

ئەو ئاسمانەی بێ کشتوکاڵە، باران دەبەخشێت. مەرگ، دەستهەڵنەگرتن لە ژیانمان پێ دەبەخشێت. ژیان، مەرگی زیاتر دەبەخشێت. پیاوی ئایینی خوا ناناسێت. ئەوی هەموو شتی لەدەست داوە، دەیداتێ.

# 99

له قه‌لای خۆلین نامه‌که‌ی باوکم ئاشکرا بوو. ئه‌و پیتانه‌ی نه‌ده‌بینران وه‌کوو تیشکی خۆر دیار بوون. باوکم به خه‌تێکی جوان نووسیبووی:

**"ئه‌و رۆژه‌ی ناوه‌رۆکه‌که‌ی ئاشکرا ده‌بێت، له جێگه‌ی خۆت بمێنه‌وه. نامه‌که له گۆری خوان دی مۆلینای باپیرتدا بشاره‌وه."**

# 100

**کارمن دی مۆلینا**

**کوینکا/ ١٦٤١**

لە ڕێگە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی لەسێدارەدانم لە سۆنگەی لە ئایین هەڵگەڕانەوەم، دوا وشەی خۆم دەنووسم:

**"ئەم شارە شاری منە. مردووەکانم ئا لێرەدان. یادگەم لێرەیە."**

# 101

## له كاغەزەكانی ئیبراهیمی كوڕی میگێل دی مۆلینا

### تەتوان

باوكم ڕایسپاردم كاغەزەكانی لە ناو سندووقێكدا بپارێزم، هەروەها كاغەزی نوێیان بخەمە سەر بە دەستی خۆم بیاننووسم. بێ ئەوەی بە گرینگیی ئەوەی نووسراوە، یاخود دەینووسم بزانم، ڕاسپاردەكەیم جێبەجێ كرد، بەڵكوو بەوە لە گۆڕەكەیدا بحەسێتەوە. بەڵكوو لە بێ موبالاتییەكەم خۆش بێت.

لێ سەرەڕای تۆماركردن و لەبەرگرتنەوە، ڕاسپاردەی هەرە زەحمەتی باوكم ئەوەبوو ڕۆڵە و نەوەكانم هەموو ئەو كاغەزانە لە شوێنێكدا بپارێزن: یان لە ژێرزەمینەكانی كوینكا، یاخود لە قەڵای خۆلین.

لەبەر ئەوەی من تەنیا ڕاسپاردەكە دەگوازمەوە، ئەم كاغەزە بۆ نەوەكانم جێ دەهێڵم، تاكوو بزانن چی دەكەن؟!

## 102

له خەونمدا درەختێکی زەبەلاحم بینی، گەڵا گەورەکانی دەوەرین تەواوی عەردیان داپۆشیبوو. گەڵاکان زەردی پایزیی بوون، هەر دەستت بەریان بکەوتایا دەشکان. بایەکی توندی دەهات، وام هەست دەکرد بێبەزەییانە دەمبات. له کاتێکدا بیرم لەوە دەکردەوە خۆم بدەمە پاڵ درەختەکە، شتێك وای لیٚ کردم گەڵایەك هەڵبگرم دەتگوت هی منە.

گەڵاکە گەورە هێندەی ناولەپی جووتیارێك دەبوو، شەقشەق چون له ئەزەلەوە وا بووبێت. کاتێك لێم ڕوانی، تێبینیی ئەوەم کرد ناوم لەسەر ئەتەمەکانی (نسیج) کۆڵراوە. پێچەوانەی واقیع، له خەونەکەدا ئینتیمام بۆ دایکم بوو.

له ساتێکدا زریانەکە وەستا، بێدەنگییەکی هەتاهەتایی ئەوێی داگرت، له بان درەختەکەوە گەڵایەلێك چاویان تیٚ بڕیم ڕوخساری منداڵانی خەندەلێویان هەڵگرتبوو. لەسەر عەردەکەش ناوە هەڵکۆڵراوەکانی نێوان ئەتەمی گەڵا ئەزەلییەکانم بۆ ئاشکرا بوون. تێیاندا ئەم ناوانەم خوێندەوە: عەبدوڵلا، ئایشە، مەریەم، خوان، ماریا، کارلۆس، میگێل، خوانا، مانوێل، کارمن، ئیبراهیم. لەو کاتی بۆ پێشەوە بە ملی سووڕاو بۆ دواوە گەڵاکەمم هەڵگرتبوو و بەرەو ڕووگەیەك دەڕۆیشتم شارەزای بووم، بینیم گشت گەڵاکان بوونە درەخت، یەخەیان گرتبووم و منیش ڕامدەکێشتن.

## 103

ئەو ڕۆژەی دوا گەشتم دێت و
خۆم بۆ گەمییەکی نەگەڕاوە ئامادە دەکەم،
لەسەر ڕۆخەکە بە بێ جانتا دەمبینن،
نیمچە ڕووت، وەکوو کوڕانی دەریا.

**(ئەنتۆنیۆ ماچادۆ)**

# سەرچاوەکان

لەم ڕۆمانەدا وێڕای گەشتە مەیدانییەکانم و خوێندنەوەی ئەرشیفەکانی تایبەت بەو قۆناغەی باس کراوە، سوودم لە گەلێك کتێب و لێکۆڵینەوە وەرگرتووە، لێرەدا وەکوو نووسەر دەخوازم سوپاسی خاوەنەکانیان بکەم:


1. Fioravanti, M Victoria: Agrida Burillo, Fernando: Lopez Garcia, Bernabe.

Romon Lourido y el estudio de las relaciones hispanomarruquies, la agencia espanola de cooperacion para el desarrollo, 2010.

2. Garcia Arenal, Mercedes, La aljama de los moros de Cuenca del siglo XV, estudio en la Universidad de Complutense de Madrid.

3. Garcia Arenal, Mercedes, Inquisicion y moriscos: los procesos del tribunal de Cuenca, Edit: Siglo XX1, 2009.

4. moliner, Antonio, la expulsion de los moriscos. Edit: Nabla ediciones, 2009.

5. ابن حزم، رسائل ابن حزم الاندلسي، تحقيق د. احسان عباس، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، ط٢، ١٩٨٧.

6. كاسترو، اميريكو. اسبانيا في تاريخها: المسلمون والمسيحيون واليهود. ترجمة: د. علي منوفي، المركز القومي للترجمة ٢٠٠٢.

7. لونجاس، بدرو. حياة المورسكيين الدينية. ترجمة: د. جمال عبدالرحمن، المركز القومي للترجمة ٢٠١١.


وێڕای ئەو کتێبانەی لە ناوەوەدا ناویان هاتوون.

# فەرهەنگۆك

**ئاپۆرا:** ئاپۆرە، ئاپوورە، کۆمای خەڵك پێکەوە. ازدحام.

**ئاکنجی:** نیشتەجێ.

**بسمیل:** غوسڵ، وسڵ، ڕێوڕەسمی تایبەت بۆ پاکبوونەوە و نزیکیی لە خودا.

**پریاسکە:** پریاسك، پرێسك، پرێسکە، پریزە. بوخچەی لە دەسرۆکە.

**پسمام:** پزمام، کوڕەمام، ئامۆزا.

**پەز:** مەڕ.

**پۆز:** تفنك، لووت، کەپوو، دفن، گەپ، بێڤل.

**تاتەشۆر:** تاتەشوار، تەختەبەردێك مردووی لەسەر دەشۆن.

**تفنك:** پۆز، لووت، کەپوو، دفن، گەپ، بێڤل.

**تەقەت:** شاردنەوە، وەشێراو.

**جمك:** جمکانە، دووانە، جووتە، جمێ، جمڕانە، لفانە، زگ دووانە، دوو منداڵ بە سکێك بووبن. توام.

**دژمان:** جوێن، جمان، جوون، جنێو، دژوون، خەراو، سخێف.

**دیرۆك:** مێژوو. تاریخ.

**ڕووگە:** قیبلە. شوێنێك زۆر کەس ڕووی تێ دەکەن.

**زانخواز:** لاپرەسەن، لاپرە، لاپرەسەنگ، کونجکۆڵ، زۆرپرسکەر، خۆهەڵقورتێنەر، خۆتێهەڵقورتێن، دەستێوەردەر، لووتتێوەژەن، ماتێکەر، مایتێکەر. فضولي.

**زایننامە:** بڕوانامەی لەدایکبوون. شهادة میلاد.

**سەرجەلە:** سەجەرە، شەجەرە، شەجەرەنامە، ڕەگەزنامە، نووسراوی ناوی باوباپیران.

**غەزڵین:** غەزرین، لە جێ لانەکەوتن، مانگرتن، گەگرتن، تۆران و قسەنەکردنی یەکێك.

**قایە:** بەردەشاخ.

**قشلە:** قژڵە، قشرە، سەربازخانە، بنکەی چەکداریی دەوڵەت لە جێگەیەکدا.

**قەڵاندۆشکان:** قەڵاندۆش، قەڵاندووش، قەڵادۆش، قەڵادۆشە، قەڵادووشان، سواری سەرشانی کەسێك.

**قۆچان:** تاپۆ، سەنەد، قەباڵەی موڵك.

**کازیوە:** کازێوە، کازیبە، بوولێڵەی بەیان، تاریك و ڕوون، سەحەر، شەبەقی، گەردی بەیان، کازوکووز، مەلابانگدان.

**کڵاوئاسن:** کڵاوخود. کڵاوخوودە، کڵاوزرێ، تاسکڵاو، کوومزرێ، خوودە.

**کۆتەڵ:** پەیکەر، سەروسەکوت.

**گردەلم:** گردەلمین، گردی لمین، لمەتەپۆلکە، گردەبا، گەردەبا، خمخمۆرك، زەویی قوپاو، هەردی ڕۆچوو. کثبان رملیة (رمال متحرکة).

**گلکۆ:** گڵی بەسەریەکداکراو، کۆمای خاك، گۆڕ، قەبر.

# کتێبە چاپکراوەکانی وەرگێڕ

١. ئاویزە٢. بەهاوکاریی حەمە سەعید زەنگنە (کۆمەڵە بەرهەم)، ئامادەکردن. چاپخانە ئۆفیسی الادیب. کەرکوك٢٠٠٣

٢. دیالۆگ (چاوپێکەوتنی ئەدەبی) چاپخانەی ئەرەبخا. کەرکووك٢٠٠٥

٣. ناعەقلانییەت لەگوتاری جەبهەی تورکمانیدا. جەبار قادر. چاپخانەی ئەرەبخا. کەرکوك٢٠٠٥

٤. هیزە وریابن (کۆمەڵە چیرۆك) عەزیز نەسین. لە بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران (هەولێر). چاپخانەی گەنج. سلێمانی٢٠٠٥

٥. ژنێك بۆ شەش پیاو (کۆمەڵە چیرۆك) عەزیز نەسین. خانەی وەرگێڕان. هەولێر٢٠٠٦

٦. وەرزی کۆچ بەرەو باکور (ڕۆمان) ئەلتەیب ساڵح. دەزگای ئاراس. هەولێر٢٠٠٧

٧. درێژترین ساڵ (ڕۆمان) زوهدی داودی. دەزگای ئاراس. هەولێر٢٠٠٨

٨. شیکاگۆ (ڕۆمان) عەلا ئەسوانی. دەزگای ئاراس. هەولێر ٢٠٠٩

٩. باڵەخانەی یاقوبیان (ڕۆمان) عەلا ئەسوانی. دەزگای ئاراس. هەولێر ٢٠٠٩

چاپی۳، دەزگای فێربوون بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە. هەولێر ۲۰۲۳

۱۰. چەمك و ئیستاتیکای شوێن لە ئەدەبدا چ۲ (لێکۆڵینەوە). دەزگای ئاراس. هەولێر ۲۰۰۹

۱۱. مرۆڤێك ناوی لەناواندا نییە (ڕۆمان) واسینی ئەلئەعرەج. ئاراس. هەولێر ۲۰۱۰

۱۲. شەماعیە (ڕۆمان) عەبدولستار ناسر. ئاراس. هەولێر ۲۰۱۰

۱۳. تاکسی (ڕۆمان) خالد ئەلخەمیسی. ئاراس. هەولێر ۲۰۱۰. چ۲ ئەندێشە۲۰۱۷

۱٤. کەسێتیی تاکی عێراقی - باقر یاسین. ئاراس. هەولێر۲۰۱۱. چ۲ دەزگای سەردەم ۲۰۱٦

۱۵. موبارەك و سەردەمەکەی - محەمەد حەسەنێن هەیکەل. لەگەڵ عومەر عەلی غەفور. ئاراس. هەولێر۲۰۱۲

۱٦. مەکیاڤیللی لەتای تەرازوودا- د.موحسین محەمەد حوسێن. ئاراس. هەولێر ۲۰۱۳

۱۷. میرنامە( ڕۆمان) جان دۆست. ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە. چاپخانەی رجایی - تاران۲۰۱۳

۱۸. عێراقییەك لە پاریس (ڕۆمان) سەمۆئێل شەمعون. ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە. چاپخانەی رجایی - تاران۲۰۱٤

۱۹. ڕیشەکێشکردن و دیکتاتۆریی تاکباوەڕی لەعێراقدا - باقر یاسین. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی۲۰۱۵

۲۰. عەشیقی وەرگێڕ (ڕۆمان) جان دۆست. ناوەندی غەزەلنووس. سلێمانی ۲۰۱۵

٢١. زەنگەکانی ڕۆما (ڕۆمان) جان دۆست. ناوەندی غەزەلنووس. سلێمانی٢٠١٥

٢٢. ماڵە ئەندەلوسییەکە (ڕۆمان) واسینی ئەلئەعرەج. ناوەندی غەزەلنووس. سلێمانی٢٠١٥

٢٣. وێرانەپیاو (ڕۆمان) عەبدولعەزیز بەرەکە ساکن. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠١٧

٢٤. هەرەسی ژێرخانێك (ڕۆمان) نەوزەت شەمدین. ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە. چاپخانەی ئەندێشە ـ سلێمانی ٢٠١٧

٢٥. کوژرانی کابرای کتێبفرۆش (ڕۆمان) سەعد محەمەد ڕەحیم. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠١٧

٢٦. مارتینی بەختەوەر (ڕۆمان) جان دۆست. ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە. چاپخانە: تاران. ٢٠١٧ سلێمانی

٢٧. ژنەی خوانەناس (ڕۆمان) عەلی بەدر. ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە. چاپخانە: ئەندێشە. سلێمانی ٢٠١٨

٢٨. سەماهانی (ڕۆمان) بەرەکە ساکن. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. چاپخانەی سەردەم. سلێمانی ٢٠١٨

٢٩. کچانی چیرۆکخوان (ڕۆمان) مەها حەسەن. ناوەندی ڕۆشنبیریی ڕەهەند. چاپخانە: ناوەندی ڕەهەند. سلێمانی ٢٠١٩

٣٠. مێژووی خوێنڕێژی لە عێراقدا ـ باقر یاسین. ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە. چاپخانە: تاران ٢٠١٩ سلێمانی

٣١. سێبەرەکانی جەستە (ڕۆمان) سەعد محەمەد ڕەحیم. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. چاپخانەی سەردەم. سلێمانی ٢٠١٩

٣٢. خەسێنراو (نۆڤلێت) سەلاحەدین بوڵوت. ناوەندی غەزەلنووس. چاپخانەی تاران ٢٠١٩

٣٣. زریاب (ڕۆمان) مەقبول ئەلعەلەوی. ناوەندی ڕۆشنبیریی ڕەهەند. سلێمانی. چاپخانەی پیرەمێرد ٢٠٢٠

٣٤. گەمژەیی مارکیز (ڕۆمان) عەواد عەلی. دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان. چاپخانە: تاران ٢٠٢٠ سلێمانی

٣٥. دەستنووسی پیترسبۆرگ (ڕۆمان) جان دۆست. ماڵی وەفایی. هەولێر ٢٠٢٠

٣٦. تراژیدیای نووسەرانی ڕووس. جەودەت هۆشیار. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠٢٠

٣٧. ڕۆمان لە نێوان ئەندێشە و واقیعدا. جەودەت هۆشیار. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠٢٠

٣٨. تۆ هەموو شتە جوانەکانی منی (ڕۆمان). ئەحمەد ئال حەمدان. ناوەندی ڕۆشنبیریی ڕەهەند. سلێمانی ٢٠٢١

٣٩. سیماکان (ڕۆمان). زەینەب حفنی. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس. هەولێر ٢٠٢٢

٤٠. کەڕەنا (ڕۆمان) محەمەد ئەلئەسفەر. دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان. چاپخانە: تاران ٢٠٢٢ سلێمانی

٤١. لە حزووری کتێبدا (وتاری ئەدەبی). عەلی حوسێن. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ٢٠٢٢

٤٢. پەیامی ڕووناکی (ڕۆمان). محەمەد تەرەزی. دەزگای فێربوون بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە. هەولێر ۲۰۲۳

٤٣. وێردەکانی ئەیوبی پاسەوان (ڕۆمان). ئەحمەد ئەلعەتییە. دەزگای فام بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە. هەولێر ۲۰۲۳

٤٤. نووسەرانی ڕووس لە ژێر چەکووشی بەڵشەڤیزمدا. د. جەودەت هۆشیار. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. سلێمانی ۲۰۲۳

## دەربارەی نووسەر

ڕۆماننووس و وەرگێڕ "ئەحمەد عەبدوللەتیف" لە میسر - قاهیرە ساڵی ١٩٧٨ لەدایك بووە. تاكوو ئێستا پێنج ڕۆمانی نووسیوە: "كلیلساز" ٢٠١٠، "جیهانی مەندڵ" ٢٠١٢، "كتێبی پەیكەرتاشەكە" ٢٠١٣، "ئیلیاس ٢٠١٤، "قەڵای خۆلین" ٢٠١٧.

لە زمانی ئیسپانییەوە چەندین ڕۆمانی بۆ عەرەبی وەرگێڕاون. ئێستا خوێندكاری دكتۆرایە لە زانكۆی غەرناتەی ئیسپانی.

**سەباح ئیسماعیل/ كەركووك**

٢٠٢٣/٥/١٨

ئەم ڕۆمانە باسی ئەو موسوڵمانانە دەکات کە دوای لەدەستدانی دەسەڵاتی ئیسلامی لە ئەندەلووس، لەژێر دەسەڵاتی کرستیاناندا مانەوە و ناچاری گۆڕینی ئایینیان کردن، پێیان دەگوتن مۆریسکی.

لێرەدا ڕۆماننووس وەک ئەزموونگەرێک لە ڕێگەی خەیاڵی مێژووییەوە باسی خانەوادەیەک دەکات "محەمەد دی مۆلینا"، بە پەنابردن بۆ دەستنووس و نامە و دیکۆمێنت و ڕاپۆرتی نهێنیی دادگەکانی پشکنینی ئەو کاتە، ڕازی پتر لە دوو سەدە و نیوی ئەو بنەماڵەیەمان بۆ دەگێڕێتەوە. باپیریان وەسیەت بۆ ڕۆڵەکانی دەکات پشتاوپشت مێژووی ئەو بەهەشتە ونبووەیان بنووسنەوە و وەریبگێڕن و ڕێکی بخەن و لە ژێرزەمین و تونێل و کونوکەلەبەری ماڵەکانیاندا بیانشارنەوە، چونکە یادگە وێرانەیە و نووسینیش نۆژەنکردنەوە. لەو نێوەدا گێڕەرەوەکان مێژووی مۆریسکییانمان بۆ دەگێڕنەوە، هەر لە هاتنە ناوەوەی کاسۆلیکان بۆ شاری کوینکا و سەپاندنی ئایینی کرستیانی و زمان و جلی ئیسپانی بەسەر ڕامکراواندا. وێڕای ئەمانەش ئەوی مایەی سەیرە، بە خەیاڵ و خوێنی گەڕانەوەیان بۆ زێدی خۆیان، کلیلی ماڵ و نەخشەکانیان هەڵگرتبوون و زمانی ڕەسەنی خۆشیان پاراستبوو و لە ژێرەوە هەر لەسەر ئایینەکەی خۆیان مابوون، کەچی ئینجاش ئەوانی بوون بە کرستیان بۆ ئەوەی خاکی خۆیان جێ نەهێڵن، جێگەی گومان بوون و کەوتنە ژێر لێپرسینەوەی دادگەکانی پشکنین و ناچاری کۆچپێکردن هاتن، یاخود ئەشکەنجە دران و لە ملیان درا.